لەوتارەکانی مامۆستا شێرزاد

# بەخەبەرهاتن




نووسینەوەی
سناء احمد زراری

پێداچوونەوەی
شیماء بشری جمال





چاپی یەکەم
هەولێر
٢٠١٢ ز
١٤٣٣ ك

# بـــەخـــەبـــەرهـــاتـــن

## لەوتـارەكانی مامۆستا شێزاد


نووسینەوەی

سناءاحمد زراری

پێداچوونەوەی

شیماء بشری جەمال



چاپی یەكەم

هەولێر

١٤٣٣ك        ٢٠١٢ز

## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: بـەخـەبـەرهـاتـن (لەوتارەکانی مامۆستا شێزاد)
نووسینەوەی: سناء احمد زراری
پێداچوونەوەی: شیما و بشری جەمال
تایپو نەخشەسازی بەرگ و ناوەرۆك : نووسینگەی هیوا
چاپ: یەکەم/ ٢٠١٢

لەبەرێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەی هەولێر ژمارەی سپاردنی ( ٥٣٢ )
ساڵی (٢٠١٢)ی دراوەتێ

# پێشەکی

بەناوی خودای میهرەبان

زۆر دڵ خۆش ئەبم کاتێك ئەبینم خوشکەکی بەرێزم یان برایەکی ئازیز هەڵدەستێت بە کۆکردنەوەی ووتارەکانم چونکینیّ بەهمەتی پەنجەو قەلەمی نورینیان وا ئەکەن ئەم ووتارانە نەمرن و سوودو فائیدەکەیان هەر بەردەوام بێت بەمەش منیش و ئەوانیش بەهەرەمەند ئەبین لە سۆزو بەخشیش و میهرەبانی خودای پەروەردگار بۆیە ئەڵێم هەر بمێنیّ ئەم خامەو پەنجانە وە خوا بۆ خۆی پاداشتی خێریان بداتەوە هەم لە دونیاو هەم لە قیامەت وە لە کۆتایدا دوعای خێر ئەکەم بۆ دوو خوشکی ترم کە ئەوانیش بەسەردا چوینەوەو بە خەتەکی جوان دووبارە نوسییانەو کە خوشکە(سیما جمال و بشری جمال) خودا لە دونیاو قیامەت رووسپیان بکات وە دوعای خێریش بۆ هەر کەسێك کە بە یەك ووشە بەشداری ئەم کارە خێرەی کردبێت.

إنشاءالله ئەوانەی هیچی وون نابن لای خودای میهرەبان وە داواکارم لە یەزدان هەموومان کۆبکاتەوە لە مجلسی محمد المصطفی(ﷺ) وە لە خزمەتی دابنیشین و وە بە لیقای خودای گەورەش شادبین لە فردوسی بەرین... أمین.

١- دڵسۆزی - الاخلاص

٢- حسن الخاتمه

٣- بەخەبەر هاتن

٤- تەوبەکردن

٥- باپاند وەر گرین لەم بەسەر هاتە.

# ١- دڵسۆزی الاخلاص

بسم الله الرحمن الرحيم

وصلى الله وسلم وبارك على سيدنا وحبيبنا محمد وعلى اله وصحبه اجمعين.

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته.

پێشەکی: پێ خۆشحاڵم لەخزمەت ئێوەی ئازیزو خۆشەویست گەیشتم خودای گەورە هەموو لایەکمان سەرکەوت بکا خودای گەورە بە پشتیوانی خۆی یارمەتی دەرمان بێ کە بەندەیەکی موخلیس و پاك بین لەبۆی وە هەموو ئیش و کارەکانمان لەبەر خاتری ئەو بێ لەترسی ئەوبێ لەبەر ڕەزامەندی ئەو بێ خودای گەورە هەموو لایەکمان بپارێزی لە نەخۆشی و ڕیا، وە دوورمان بخاتەوە لە هەموو کردەوەیەك کەوا بەتاڵ ئەبێتەوە خودای گەورە یارمەتی دەرمان بێ کە کاری چاك ئەنجام بدەین، خودا لە خۆمان ڕازی بکەین هەموومان بە خزمەت خودای رب العالمين بگەین بە سەرێکی بەرزو بە چاوێکی گەش و بە ڕوویێکی سپی لە ڕۆژی قیامەکەتدا انشاالله.

خۆشەویستانم یەکەم بابەت کە اخلاصم هەڵبژاردوە بۆ ئێوەی ئازیز چونکە یەکەم سیفەتی هەرە بەرزی ئیمانداران و موتەقیان و عابیدان کە پاکی و بێگەردی دڵیانە بۆ هەر کارێك کە ئەیکەن چونکە بە ڕاستی ئیخلاص و بێگەردی ڕووحی ئەو ژیانەیە ڕووحی بەندایەتی یە بۆ خودای

گەورە رووحی دینداریە. سری قەبول بوونی هەموو کردەوەیەکی چاك تەنها ئیخلاصە بۆیە(ابن عطاء الاسکندری) رەحمەتی خودای لێ بێ کتێبێکی هەیە بە ناوی(الحکم العطائیة) دەفەرمووێ( الاعمال صورة قائمة وارواحها وجود الاخلاص فیها) واتە: کردەوەکانمان وێنەیەکن لەو گۆری بەڵام سری ئەو کردەوەیە کە خودای گەورە قبول بکا ئەوە عەمەلەت لێ قەبول بکا ئەوە سری ئیخلاصە لەم کردەوەدا.

جا عولەمایان رەحمەتی خودایان لێ بێت زۆر وەسفی ئیخلاصیان کردووە جا پێنج وەسم بۆتان نوسیوە یەك لەوان: (هی تصفیة الفعل عن ملاحظة المخلوقین والاعجاب الفاعل بنفسه) واتە اخلاص ئەوەیە تۆ ئیشی خۆت تەسفیە بکەی لەوەی خەڵك تەماشات دەکات یان تەماشات ناکات زۆر لە لات موهم نەبێ بەلکو هەموو کردەوەیەکت بۆ خودا بێ وە عوجبیش ببێ نەبێ لەوەی کە کردبێت وە ئەنجامت داوە لە کاری باش یەکێکی تر دەفەرمووێ(هو بنسیان رؤیة الخلق فی دوام النظر الحق) ئەوەیە تۆ کاتێك هەر کردەوەیەك دەکەی لە یادی کەی کە خەڵك تەماشات دەکات گوێ پێنەدەی لەبەر ئەوەی تۆ ملاحضە ی رب العالمین دەکەی ئەو ئاگاداری ئیشەکانی تۆیە یەکێکیتریان دەفەرمووێ(هو استواء الاعمال العهد فی الظاهر والباطن) واتە: ئەو بەندەیە لە دیار و نادیار کردەوەکانی وەك یەك بن وە هەروەها لە ژوورەوەو دەرەوەش وابێ وەك کەسێك دەچێتە مزگەوت نوێژ دەکات سونەتیش دەکات لە مالیش وا دەکات عەینی شت ئەوە دەلیلی ئیخلاصە وە دەفەرمووێ(لاتقبل علی عملك شاهدا غیر الله)

ئەوە ئیخلاصە واتە ئەو ئینسانە هەموو ئیشەکی تەنها بۆ خودا بێ کە تۆ غەیری خودا شاهد لەسەرکردەوەکانی داوا نەکەی جا هەموو ئیشێکت تەنها و بەس مەخسەدت خودابێ کە خودای گەورە لێت قەبول بکاتن ئەوە ئیخلاصە مانای وایە ئینسان هەر دینداریەك بکا هەر کردەوەیەك بکا ئەوا دەبێ لە دەروونیدا عەیاری دڵی خۆی راست بکا چەنکە ئینسان وەك سویچی پانکەی وایە چۆن پانکە ژمارە ١ ٢ ٣ ٤ فول تێدایە دڵی مرۆڤی خودای جله وعلی خەڵق مەدح سەنا هەموو شتێکی تێدایە.

جا دەبێ عەیاری خۆت بەس بێنە سەر(الله) ی ئەوە کردەوەکانت ئینجا خودای گەورە لێت قەبول دەکا بەڵام دوو جۆرە ئیخلاص هەیە ئیخلاص لە دین وە ئیخلاص لە بەندایەتی و تاعەتدا.

جۆری یەکەم: اخلاص لە دین ئەوەیە بزانە وەکو جوو دیانەکانمان لێ بێت توشی ئینحراف ببین لە دینەکەی خۆیاندا. بۆیە خودای گەورە دەفەرمووێ(مخلصین له الدین) واتە: دینەکەمان خالیسەن موخلیسەن هیچ شتێکی تێدا نەبێ غەیری ئەو دینە کە خودای گەورە داوامان لێ دەکات. هیچ زیادەو کەمی لەدینەکە نەکەین بەڵکو چۆن پێغەمبەر محمد(ﷺ) هێناویەتی ئاوا وەریبگرین و کاری پێ بکەین.

جۆری دووەم: إخلاص لە تاعەتدا ئەوەیە هەرئیشێکی باش بکەن تەنها و تەنها مەبەستت خودابێ بۆیە فضلی کوری عیاض دەفەرمووێ(ترك العمل لاجل الناس ریاء) واتە: ئەگەر تۆ واز لە ئیشێك بێنی لەبەر خەڵکی ریایە دەتەوێ ئیشێك بکەی لەبەر خەڵکی ناکەی تا نەبینن یا نەزانن( العمل

لاجل الناس شرك) وە هەروەها دەفەرمووێ کردەوەیەك بکەی تەنها بۆ خەڵکی شیرکە چونکە دەبێ بۆ خودا بکەی نەوەك بۆ خەڵکی جا ئیخلاصیش ئەوەیە خۆت لەو دووانە بپارێزی نە ئیشێك تەرك بکەی لەبەر خەڵك نەئیشێك بکەی بۆ خەڵك بەڵکو دەبێ هەر ئیشێك بکەی بۆ رب العالمین ئەنجام بدەی إخلاص بە چ دورست دەبێ بە دوو شت دورست دەبێ بەیەقین و بەسەبر.

یەقین ئەوەیە تۆ هەر ئیشێك دەکەی یەقینت بێ خودای گەورە ئاگادارە بەو ئیشەی تۆ ئایە ئەو ئیشەی بۆ خودا دەکەی یان بۆ خودا ناکەی جا ئەلێرە دا شەروەك کە چۆن کارەکانی بۆ خودا ئەنجام نەدات کە ئەو خاوەنیەتی دەیگرێ جا کە ئەم یەقینە دورست بوو بە خوایەتی خواو محتاجی بەندە بەو خوایە. جا کە یەقینت بۆ خودای گەورە ئاگادارە بە هەموو جوولەو کارەکانت ئیشەکەت بە إخلاص بۆ خودا ئەنجام دەدەی دووەم وە بە سەبریش دورست دەبی چونکە ئینسان شتێك دەکا حەزی لێ یە زوو پاداشتەکەی بدرێتەوە زوو بلاو بێتەوە لە ناو خەڵکی نەخێر دەبێت سەبرت هەبێ تۆ پاداشتەکەی لە رۆژی قیامەت لە خودای گەورە وەردەگری جا ئەوەی کە یەقین و سەبری لێ فەوتا إخلاصی بۆ دورست نابێ ئینسان دەبێ سەبری هەبێ یەقینیشی هەبێ ئەو کات ئیخلاصەکەی بۆ دورست دەبێ خودای گەورە دەفەرمووێ﴿وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ﴾ السجدة:٢٤ واتە: کەسانێکمان هەڵبژارد ئەئیمەیەکیان هەڵبژارد واعی بوون بۆ دینی خودا بەڵام خودای

گەورە دوو سیفەتیان باس دەکا(لَمَّا صَبَرُوا) چونکە سەبریان دەگرت هەموو ئیشێکیان بۆ خودا بوو چاوەروانی لوتفو پاداشتی خودای گەورەیان دەکرد (وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ) یەقینیان هەبوو بەئایەت و نیشانەی رب العالمین باری دەروونی ئێمە لەگەڵ إخلاص سێ جۆرمان هەیە:

١- یان ئیخلاصێکی تەواو تەواوە.

٢- یان ریایەکی تەواو تەواوە.

٣- یان هەردووکیان تێکەڵاوە.

یەکەم: إخلاص تەواو تۆ هەر ئیشێك دەکەی تەنها بۆ خودابێ هیچ خۆشەویستی نەفس و پاداشتی لە خەڵك تێدانەبێ ئەوە لای خودا سەد لە سەد پاداشتی وەردەگرێ.

دووەم: ریا ئەوەیە هەموو ئیشێکی کە دەکا بەس بۆ خەڵکی دەکا نوێژی تاعەتی قورئان خوێندنی بانگکردنی خەڵکی بۆ لای خودا چاکەو پیاوەتی بەس بۆ ئەوەی خەڵك باسی بکەن و ببینن ئەوەش سەد لە سەد لە ریایە هیچ خێر و پاداشتی نیە وە سزای لەسەرە چونکە هیچی بۆ خودا نەکردووە.

سێیەم: کە زۆربەمان توشی دەبین ئەوەیە هەر ئیشێك دەکەین ریایەکی تێدەکەین جا(ابن قدامە) رەحمەتی خوای لێ بێ وەڵاممان نەداتەوە ئایە ئێمە پاداشتمان هەیە ئێمە ئیشان دەکەین لە کاتی ئیشەکە تووشی ریا دەبین حاڵەتی ریا لەگەڵ ئیخلاصدا کامەی بەهێزتر بوو ئەوی بۆ حیسابە ئەگەر هاتوو ریایەکەی بەهێزتر بوو لە ئیخلاصەکەی ئەوە

ریایەكەی دەچەسپێ پاداشتەكەی لە دەست دەچێ وە سزای لەسەرە بەلاَم ئەگەر ئیخلاصەكەی زیاتر بوو لە ریایەكەی بە قەد ئیخلاصە زیادەكەی خودای گەورە پاداشتی ئەداتەوە وەك كەسێك كە دەچێت بۆ حەج بە نیازی شت كرین بۆ ئەوەی قازانج بەدەست بێنیێ ئەوە حەجەكەی شتێكی كەتیێ ئەوە خێرو پاداشتەكەی كەم دەبێتەوە بەلاَم ئەگەر مەبەستی یەكەم بۆ حەج كردن بوو بۆ خودای گەورە بۆ بەندایەتی جێ بە جێ كردنی واجبەكەی ئەوە پاداشتی لەلای خودای گەورە وەرئەگریێ جا ئەبێ زۆر ئاگامان لە خۆمان بێ ریا غالب بی ئەوە پاداشتەكەی دەخوا تووشی سزای خودای گەورە دەبێ بەلاَم ئەبێ بزانین بچوكترین ریا لە كارەكانماندا یان لە هەر خێرێكدا پاداستی زۆرمان لێ ئەفەوتێنێ ئەبێ ووریا بین. (ابن قدامە) ئەو ئایەتە دێنێتەوە﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَاعِفْهَا﴾ النساء:٤٠ واتە خودای گەورە زوڵم لەكەس ناكا بەقەد میسقالە زەریەك خێرو پاداشتی موخلیسەن بۆ خودای بێ خودای گەورە لێ ی قەبول دەكا با بزانین ئایە ثەمەرەكەی چی یە بەریوومی ئیخلاص چەندە بەروبوومی ئیخلاص هەم لە دونیا لەبەری دەخوا هەم لە قیامەت بۆیە دەڵێم ئەو كەسەی كە موفلیس بێ دڵی خۆی یەك لا بكاتەوە﴿وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ﴾ البينە:٥ بزانین ئیخلاص چۆنە ئیخلاص ئەوەیە هەموو ئیشێكمان هەستانمان و دانیشتنمان و خوێندنمان هەتا خواردنمان سەلام و سەردانمان تەنها بۆ ڕەزامەندی خودای گەورە بێ بزانین چ بەرهەمێكی هەیە:

یەکەمین: سەرکەوتن بەسەر دوژمن دا جاچ دوژمنی وەك دوژمنانی دینی خودا بێ کە تۆ لە جەنگ و جیهاد دای یان لە کێشەدای یاخود دوژمنی نەفس و شەیتانی بی لە هەردووك سەنگەردا خودای گەورە بە سەرت دێخی بەس موخلیس بە ئەوەتا پیغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرموێ(انما ینصر الله هذه الامة بضعفائها) واتە خودای گەورە ئەو ئومەتەی بەزەعیفەکانی بەسەر دەخا کامەیان لات و هەژار بن بەوان سەردەخا، بە دووعاکانیان(بصلاتهم) بە نوێژەکانیان(واخلاصهم) بە ئیخلاصیان بۆیە دەڵێم وریا بن والله بەشێوەو دیکۆر و ریش نیە نەخێر بەڵکو تەقوا لە ژوورەوەیە تەقوا لە دڵە وامەزانە ئەوەی ریشی درێژە بە ئیخلاصە نەخێر وانیە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ( ربی اسفث اغبر مطرود علی الابواب لو اقسم علی الله لابره) واتە پیاوێکی غەریبی تۆزاوی(مطرود علی الابواب) دێتە دەرگات دەری دەکەی کەیفت بە چارەی نایێ(لو اقسم علی الله لابره) بەڵام لەلای خودا زۆر گەورەیە چونکە موخلیسە جا مرۆڤ هەموو کات دەبی داوای دووعا لەوان بکات چونکە ئەو کەسانەی کە لاتن کە غەریب و هەژارن خودا دووعایان قەبول ئەکا زۆرجار دەبینین کەسێك دەچێتە شوێنێك تێبینی ئەوە دەکا کامەیان بەشان و شەوکەتی بێ حەز دەکا خۆی لەو نزیك بکاتەوە وا دەزانێ بچیتە لای ئەو باشە نەخێر وانیە بۆیە موسڵمانەکان لە یەك لە غەزاکاندا لەگەڵ بێ باوەران بەشەر هاتن یەك لە تابعیەکان لەگەڵ بوو ناوی محمدی کوڕی واسع بوو زۆر پێوێکی صالح

بوو محمد دووکانداریش بوو قائدی موسڵمانەکان گوتی گوتی محمد لە کوێیە وا لە مەیمەنەیە لە لای حەیشەکەیە وا پەنجەکانی بەرز کردۆتەوە بۆ ئاسمان ئەپارێتەوە فەرموی واللە(تلك اصبع احب الی من مئە الف سیف) واللەهی ئەو پەنجەی کە محمد واسع بەرزی کردۆتەوە بۆ ئاسمان لای من بەرزترە لەسەد هەزار شیر بەقووەترە چونکە موخلیسە زۆر پاکە هەر کاتێك لەخودای بپارێتەوە خودای گەورە نەسرەتی موسڵمانان ئەدا(مەسلەمەی کوری عبدالملك) سەرکردەی سوپای موسڵمانان بوو لە فتوحاتەکاندا کاتێك لە یەکێك لە شەرەکان لە شارێك قەلایەك زۆر عاسێ بوو چەندی دەکرد نەی دەتوانی فەتحی بکا هەتا کۆتایی زۆر شپرزە بوو لەسەر ئەسپەکەی نەگەراوە هەتا خۆی لەناو دوژمنەکان کوتا دەرگاکەشی کردەوە موسلمانان هێرشیان کرد فەتحەکە بوو جا موسەلەمە زۆر گوتی خەڵکینە بائەو پیاوە بێ کەس دەنگی نەکرد هەستا هەموو سوپاکەی کۆکردەوە گوتی سوێندتان ئەدەم بەخودا دەبێ پێم بڵێن ئەوەی خۆی پیچابوو کێ بوو لە نیوەی شەو یەکێك هاتە لای ووتی من ئەو پیاوە دەناسم کە دوێنێ فەتحی موسڵمانان کە بەدەستی ئەو بە قسمەت موسڵمانان بوو بەڵام سێ شەرتی هەیە کە دێتە لات ووتی هەرچی دەوێ ووتی هەرچی دەوێ لە خزمەتی دام بەس بیناسم ووتی یەکەم ناوی نەدەی لەلای خەلیفەی .

دووەم: پێی نەڵێن ناوت چیە و خەڵکی کوێی ی .

سێیەم: هیچ پاداشتی ناوێ ووتی من ئەو پیاوە بووم ڕاست ڕۆیشت جا لەو کات(مەسلەمە) لە هەموو نوێژەکانی ئەی ووت خودایە لەگەڵ صاحبی ئەو نەقەبەی حەشرم بکەی لە ڕۆژی قیامەت بزانە ئەوە ئیخلاصە چونکە تەنها ئەمڕۆ پاداشتی لەلای خودای گەورە دەست کەوێ وە هەروەها قەبول بوونی کردەوەکانمان واللەهی ئەگەر موخلیس بین لەهەر کردەوەیەك هەرپاداشتی وەرئەگرین لای خودای گەورە بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ(ان الله لا يقبل من العمل الا ماكان له خالصا) واتە خودای گەورە هیچ کردەوەیەك قەبول ناکا تەنها دەبێ خالیسەن موخلیسەن بۆ زاتی پاکی خودای رب العالمين بێت پیاوێك عادەتی وابوو هەموو شەوێك قورئانی دەخوێند شەوێکیان سورەتی(الكهف) خوێند پاشان شەو نوێژی کردو نوێژی بەیانی کردو نوست لە خەودا مەلائیکەتێك هاتە لای وەرەقەیەکی دای پێی کە سورەتی کهف نوسرابوو تەماشای کرد لەبن هەر پیتێك ژمارەی ١٠ دانراوە ئەوە نیشانەی ئەوەیە چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ خوێندنی هەر پیتێك لە قورئان ١٠ دە خێرت بۆ دەنوسرێ.

جا دەبینی لە بن رستەیەك لە سورەتەدا هیچ ژمارە دانەنراوە بە ملائیکەی ووت بۆ هیچ ژمارە لەبن ئەم رستە دانی یە مەلائیکەکە ووتی من نازانم دەبێ بە خودای رب العالمين بڵێم خودای گەورە فەرموی لەو کاتەی ئەو رستە قورئانیەی لەزار هاتەدەر ئیخلاسەکەی نەمابوو بۆیە لە سەوابەکەی بێ بەش بوو جا بەراستی ئینسان خێرێك و چاکەیەك و

سەردانیێلم دەكەی بۆ وا دەكەی خێرەكەت لە دەست خۆت ئەدەی بۆ دڵت یەكلا ناكەیتەوە بۆ خودا.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ هەر كەسێك سەردانی نەخۆشێك بكا ٧٠ هەزار فریشتە دووعای خێری بۆ ئەكەن دەڵێن خودایە لێی خۆشبی و رەحمی پیێ بكەی ئەگەر بە رۆژ بچی هەتا بەیانی بەردەوام دەبن جا بۆ عەیاری دڵی خۆمان ڕاست نەكەین هەر كردەوەیەك ئەكەین تەنها مەبەستمان ڕەزامەندی خودا بیێ بە ئیخلاص بیكەین بزانە تۆ كە سەردانی چەند نەخۆشان دەكەی ئەگەر ئیخلاسی تێدانەبی ئەجرو پاداشتان لە دەست دەچیێ چونكە عەیاری دڵمان لەسەر خودای لاكەوتیە رۆیشتیە بۆ لای مەدح سەنای خەڵك و شتی تر.

سێیەم: تۆ چەند موخلیس بی لە بۆ خودای واللەهی خەڵك زیاتر تۆیان خۆشدەویێ خودای گەورە لەو ئایەتە پیرۆزە دەفەرمویێ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ الرَّحْمَنُ وُدًّا﴾ مریم:٩٦ واتە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە﴿وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ كردەوەكانیان خالیسەن موخلیسەن بۆ خودایێ خودای گەورە وا دەكا خۆشەویستی دەخاتە ناو دڵی هەموو كەسێك سبحان الله چونكە ئیخلاس وات لیێ دەكا هەموو خەڵك خۆشیان بوێی پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمویێ خودای گەورە بەندەیەكی خۆش بویێ خۆشەویستیەكەی بلاو دەكاتەوە خودای گەورە بانگی جبرائیل دەكا جبرائیل دەفەرمویێ من فلانم خۆشدەویێ یافلان كوری فلان یافلانی كچی فلانم خۆشدەویێ جبرائیل ئێوەش خۆشتان بوێی جبرائیل لە حەفت

تەبەقەی ئاسمان دەڵێ ئەهلی ئاسمان ئاگادار بن خودای گەورە فلانی کوری فلانی خۆش دەوێ ئێوەش خۆشتان بوێ ئینجا ئەو خۆشەویستیە لە ناو دڵی هەموو مەلائیکەتەکان بلاودەبێتەوە پاشان ئەو خۆشەویستیە لەناو دڵی هەموو ئەهلی زەوی بلاودەبێتەوە وە خودای گەورە وا دەکا هەموو خەڵك خۆشیان بوێ سبحان الله خودا خۆشەویستی ئەو کەسە دەخاتە ناو دڵی خەڵکی﴿سَيَجْعَلُ لَهُمُ الرَّحْمَنُ وُدًّا﴾ واتە بە تایبەتی ئەوانەی بانگی خەڵکی دەکەن بۆ خودا ئەبێ زۆر مخلص بن بۆ خودای گەورە تاکو خوا خۆشەویستی بخاتە ناو دڵی خەڵکی.

چوارەم: اخلاص وا دەکا تۆ ئیشێکت نەکردووە خودای گەورە پاداشتت ئەداتەوە وەك کەسانێك عوزریان هەبوو نەدەهاتن بۆ غەزای تەبووك پێغەمبەر(د.خ) فەرموێ (ماسلكنا شعبا ولا واديا الا وهم معنا) واتە هیچ کێویك هیچ شوێنێکمان نەبریوە ئیلا ئەوان لە گەڵمان بوینە چونکە دڵیان بەخالیسی لەگەڵ ئێمە دابووە فەرموی ئێمە چەند خەم و پەژارەمان بینی لە غەزوەی تەبووك بەڵام چەند موسلمانێك عوزریان هەبوو نەچون بۆ غەزوەی تەبووك نەیان توانی بێن ئەوە خێرو پاداشتی ئەوان وەکو ئێمەیە چونکە خالیس بوونیە بۆیە پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ(من سال الله الشهادە بالصدق) واتە ئەو کەسەی داوای شەهیدی بکا بە ڕاستگۆیی و بەخالیسی واتە چونکە زۆر بەخالصی داوای شەهیدیان کردووە ئەگەر لە جێگای خۆی بمرێ ئەوا ڕۆژی قیامەت ئەیخاتە ڕیزی شەهیدانەوە. یاخود کەسێك شەو نوێژ دەکا نیازی وابوو شەو هەلسێ بەڵام لەخەو نەمێنێتەوە

پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرموێ (من أتى فيراشا وهو ينوى أن يقوم يصلى من الليل فغلبته عينه حتى أصبح كتب له مانوى وكان له صدقه عليه من ربه) واتە هەر كەسێك نییەتی وابوو شەو هەڵسێ شەونوێژ بكا بەڵام بەخەبەر نەهات خەو غەلەبەی لەسەر كردو پێی نەكرا ئەوە خێری شەو نوێژەكەی بۆ دەنوسرێ چونكە نییەتی وابوو هەڵسێ نوستنەكەشی بۆی دەبێتەخێر پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ چوار كەس وەكە یەكن كەسێك قورئانێكی جوان بخوێنی وەكەسێك نازانی قورئان بخوێنی دەڵێی خۆزگە منیش وەكو ئەو بمزانیایە قورئان بخوێنم دەفەرموێ ئەو دووە وەكو یەكن لە خێرو پاداشتا كەسێكی تر زۆر خێركەرە كەسێكیش نییەتی خێربكا ئەڵێ خۆزگە منیش دەمتوانی وەكو ئەو خێربكەم ئەو دووەش وەكو یەكن ئەوە بەرەكەت و سەمەرەی اخلاصە چونكە هەر دووكی لە چ كابرای نەخوێندەوار و چ كابرای فەقیر چونكە لە دڵرا نیەتیای وابوو گەر وەكووان بان ئاوایان ئەكرد پاداشتیان وەكو یەكە.

پێنجەم: هەر كەسێك غەمێك دەردێك موسیبەتێك موشكیلەیەكی هەبێ بەپاكی و اخلاصەوە كارێك بۆ خودای گەورە ئەنجام بدا لەپاداشتی پاك و ئیخلاصی ئەم كردەوە خودا گەورە غەم و پەژارەی لەسەرلادەبا جا هەر كەسێك هەرچی غەمو موشكیلەی هەیە بابچی لە دەرگای ئیخلاص بدا بۆ هەموو كارێك ئەوە خودا دەرگای نەجات و قوتار بوونی لێ ئەكاتەوە بزانیێ چەند ئەجرو پاداشتت هەیە پاكی و ئیخلاص لە قیامەتدا: ـ

یەکەم: نیعمەت خۆشی ژیان بەرزخی بەقسمەت دەبێ چونکە ژیانی بەرزەخ هەم خۆشی تیایە هەم نیقمەت هەم نەعیمیشی تیایە هەم عەزاب. کەسێك نازو نیعمەتی ژیانی بەرزەخی ئەنۆشێ ئەوەیە کە موخلیس بێ بۆ خودا گەورە.

دووەم: رۆژی قیامەت لەخۆی ئەمینە کە خودای گەورە عەزابی نادا ئەوە گەورەترین نیعمەتە چونکە رۆژی قیامەت کەس ئەمانی نی یە بەلاَم موخلیسەکان ئەوانەی خالیسەن کردەوەیان بۆ خودای بووە هەرچی کردوەو هەموو ژیانیان هەر لە پێناوی خودا بوو ئەوانە ئەمانیان ئەدرێتێ.

سێیەم: (تیسیر الحیساب) خودای گەورە حیسابیان بۆ ئاسان دەکا چونکە زۆر موخلیص بوینە خودای گەورە بەئاسانی حیسابیان لەگەل ئەنجام ئەدات ئەمەش گەورەترین پاداشتە تۆ حسابت لەگەلّ سانا بکرێت.

چوارەم: (سبعة یظلهم الله فی ظله یوم لاظل الا ظله ) واتە حەوت کەس لەژێر سێبەری عەرشی خودان کەئەو رۆژە هیچ سێبەرێ نی یە غەیری سێبەری عەرشی خودا نەبێ یەك لەوان (رجل تصدق بصدقه ) واتە کەسێك خێرێك بکات نەهێلێ دەستی چەپی بەدەستی بزانێ کەچی کردۆتە خێر. جابۆ ئەو سێبەرەی عەرشی خودا لەدەست خۆمان بدەین بەس عەیاری دلّمان ڕاست بکەین ئەوەلای خودا ئەجرو پاداشتمان هەیە انشاء الله.

پێنجەم: لەحەوزی کەسەر ئاو ئەنۆشێ بەلاَم ئەگەر موخلیس ەبێ پێغەمبەر(ﷺ) لە حەوزی کەوسەر ئاوی پێنادا. شەشەم:﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا

وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا﴾ مريم ٧١ لەسەر پردی صیراط ناکەوێتە خوارێ زۆربە ئاسانی ئەپەڕێتەوە ئەوانەی نەجاتیان ئەبێ لەسەر پردی صیراط تەنها موخلیسەکانی پاشان (دخول الجنە) چونە بەهەشتە بەخودای موخلیص نەبێ ئەوانەی ریا چیی بوون هەموویان واویلاو عەزابیتیان بەلاّم ئەوانەی مخلص بوینە ئەوا دوورن لەم عەزابە. ئاخیر دیتن (رب العالمین) هەر کەسێك ریا چی بێ بێ بەش دەبێ لەدیتنی خودای گەورە چونکە دیتنی (رب العالمین) گەورەترین نازو نیعمتە لەبەهەشت. جابۆیە گەر دەتانەوی ئیخلاص لاتان دروست ئەبێ:

یەکەم: شەرم کردن لە خودای گەورە ئینسان ئەبێ شەرم لە خودای گەورە بکا ئەوە ئیخلاصت بۆ دروست ئەبێ.

دووەم: (ألياس من المغلوقين) بێ ئومێدو بێ هیوابە لە خەلك چونکە هیچ شت بەدەست خەڵکی نی یە هەموو شتێك بە دەست خودایە.

سێ یەم: بترسێ کردەوەکانت لێ قەبول نەبێ چونکە ئەو ترسە وادەکا ئیخلاصت بۆ دروست بێ جا تۆ هەرکارێك دەکەی بترسێ لێت قەبول نەبێ چونکە نەوەك ریات لێ کردبێ یان بۆ خودای گەورەت ئەنجام نەدابێت با هەموو کردەوەکان تەنها بۆ رەزامەندی خودابێت.

چوارەم: ئەوەیە کە تۆ موراقەبەی ئەو خودایە گەورە لەسەرە خۆت دانێی ی چ لە ناو خەڵکی چ بە تەنیایی لە هەردوو کاتدا تۆ دەبێ موراقەبەی لەسەر خۆت دابنێ ئەوە ئیخلاصت بۆ دورست ئەبێ چونکە

خودا چاودێرو و مراقبە لەسەر بەندەکانی خۆی﴿إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ النساء:١ .

پێنجەم: بترسی لەوەی کە لە ڕۆژی قیامەت فەزع نەبی چونکە بە ڕاستی زۆر ناخۆشە فەزع بین﴿يَوْمَ تُبْلَى السَّرَائِرُ﴾ الطارق:٩ ئەو ڕۆژەی کەوا هەموو گوناح و شتە شاراوەکان دەرئەکەون جا ئەگەر خالیس بین ئەوە براوەین ئەگەر نا پەنا بە خودا هەموو شتێکمان لێ ئاشکرا ئەبێ شەرمەزارو فەزع ئەبین بەرامبەر خودا و ئەم هەموو خەڵکە.

شەشەم: هەموو کات ئینسان بپارێتەوە لە خودای گەورە کە بیپارێزێ لە ریا پێغەمبەر(ﷺ) زۆر لە خودای گەورە دەپارایەوە کەوا لە ریای دوربخاتەوە.

حەوتەم: زۆر رقت لە ریاو ریاچی ببێتەوە هەر کەسانێك ریا بکەن ڕقت لێیان ببێتەوە. بشری هانی رەحمەتی خودای لێ بێ دەفەرموێ (الله ما اتقی من احب شهرته) کەسێك موتەقی نیە ئەگەر حەزی لە شوهرەت بێ چونکە شوهرەت لەگەڵ ئیخلاص یەك ناگرنەوەزۆر زەحمەتە کابرای مەشهور ئیخلاصی پێ رابگیرێ چونکە شەیتان وازی لێ ناهێنێت ئەمەش پێویستی بە مجاهدە هەیە.

هەشتەم: لەگەڵ نەفسی خۆت بەشەر بێێ موجاهەدەی نەفسی خۆت بکەی رێی پێ نەدەی ئەو نەفسە غالب بی لەسەر قازانجێکی دونیا یا ئافەرینێك ئەو ئیخلاصەت لە دەست بدەی دەبێ کردەوەی خۆت بشاریتەوە.

نۆیەم: (مصاحبة المخلصين) واتە زۆر لەگەڵ ئینسانی موخلیس و پاك دانیشتن فێری ئیخلاصی دەبین تاكو فێری ئیخلاص ببین با لەگەڵ ئەوان بین لەگەڵ ریاچیان نەبین.

دەیەم: پێداچوونەوەو خوێندنەوەی سەرگوزشتەی ژیانی پێغەمبەران(عليهم السلام) وە پیاو چاكان وە هاوەڵان چونكە كاریگەری هەیە لەسەرمان و ئیخلاصمان بۆ دورست ئەبێ چونكە زۆر مەواقفی چاكیان هەبووە بۆیە خوێندنەوەی ژیانیان ئەزانی چ سرێكە ئەوانی گەورە كردوە ئەویش سری ئیخلاصە ئەوەش دوو نمونە لەسەر ئیخلاصیەتی تەواو و دورست.

طلحة بۆمان دەگێرێتەوە دەفەرموێ لە شەوێكی درەنگ بینیم ئیمامی عومەر دەچێتە ماڵێك پاشان چەند جارێك دووبارە بۆوە بۆیە ئەویش زۆر مەراقی كردو چوە ماڵەكە بینی پیرەژنێكی نابینای زەلیل بە تەنیا لەو خانوەدایە جا تەلحە ووتی دایە ئەو پیاوەی دێتە ئێرە چ كارێكی هەیەو كێ یە ووتی والله كورەكەم نازانم كێە بەڵام هەویرم بۆ دەكات و نانم بۆ حازر دەكا خاوێنم دەكاتەوە مالیشم هەمووی بۆ گەسك ئەداو ئینجا دەرواتەوە تەلحە ئەڵێ سبحان الله ئینجا زانیم عومەر بەو ئیخلاصەی گەیشتە ئەو پلەیە لەبەر ئەوە لە لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) گەورەیە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ واللەهی ئەگەر عومەر بە كۆڵانێك دابچێ شەیتان ناوێری بەوێدا برِوا والله ئیمامی عومەر بەو ئیخلاصەی بویتە ئەو

عومەرە ئەو دەرەجەی بەدەست هێنا بوو بە یەکێك لەو دە کەسەی موژدەی بەهەشتیان پیٚ درا.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمویٚ( لو کان من بعدی نبی لکان عمر بن الخطاب) واتە ئەگەر لە پاش من پێغەمبەرێك هەبا دەبا ئیمامی عمر ببا بە پێغەمبەر. هەروەها ربیعی کوری خیثم جارێکیان خواردنێکی زۆر خۆشی لەلا بوو دەیویست بیخوا شێتێکی دیت یەك سەر خواردنەکەی دابەو شێتە وتیان قوربان بۆ خواردنەکەت نەخوارد بۆ دات بەو شێتە خۆ نازانی چی دەخوا رەبیع وتی خۆ خودای گەورە دەزانیٚ چیم دایتیٚ ئەوە ئیخلاصە خۆشەویستانم هەر چەند باسی ئیخلاص بکەین تەواو نابی بەڵام ئەمە شتێك بوو لەو خەرمانەی کە نووسیومە خودای گەورە لەبەر خاتری ناوە جوانەکانت خودایە ئیخلاصمان پیٚ ببەخشە خودایە وامان لیٚ بکەی هەموو ئیشێکمان بەس بۆ خودای بیٚ لە پێناوی ڕەزامەندی ئەوبیٚ خودایە لە ریا بمان پارێزی خودایە کردەوەکانمان بەتاڵ نەبیتەوە أمین أمین والحمد لله رب العالمین وصلی الله علی محمد وعلی اله وصحبه وسلم.

# ٢- حسن الخاتمە

بسم الله الرحمن الرحیم

**الحمدلله رب العالمین والصلاه والسلام علی سیدنا محمد وعلی اله وصعبه اجمعین السلام علیکم ورحمه الله وبرکاته.**

خۆشەویستانم لە دەرسی ئەم جارە باسی ئاخیر خێرو حسن الخاتمەیە انشاالله سودی بۆ هەموو لایەکمان هەبێ. ئازیزانم دەگێرنەوە دەڵێن ڕۆژێك پیاوێکیان لۆ سەر قەبران دەبرد خەڵك ئەیان ووت هەزار رەحمەتی خودات لێ ‌بێت یاربی خودا عەفووت بکا و رەحمت پێبکا پیاوێکی عاقل و ژیر کە گوێی لە قسەکانی خەڵکەکە بوو ووتی(لو ترحمون علی انفسکم لکان خیرا لکم) واتە فەرموی خەڵکینە ئەگەر ئێوە بەخۆتان رەحم بە خۆتان بکەن گەلێك باشترە کە رەحمەت بۆ ئەو ئەنێرن. فەرموی چونکە ئەو مردووە لە سێ موسیبەت و سێ بەڵای گەورە رزگاری بوو بەڵام ئێوە هەتا ئێستا لەو بەڵایە رزگارتان نەبووە فەرموی موسیبەتی یەکەم: دیتنی ملك الموت(عزرائیل) چونکە دیتنی ملك الموت ترسێك و ئەزیەتێك و ئازارێکە بۆ خۆی ئەوە بوو کاتێك کە حەزرەتی ابراهیم علیە الصلاە والسلام بە ملك الموتی ووت پێم خۆشە بە شێوەی ڕاستی خۆت بتبینم کە رووحی خەڵك ئەکێشی بە چ شێوەیەك و بەچ هەیبەتێك بەچ حاڵەتێك دەچی رووحی خەڵك ئەکێشی ملك الموت بە (حەزرەتی ابراهیم)ی ووت

رووت وەرگێرە كاتێك حەزرەتی ابراهیم سەیری كرد خۆی پێ ڕانەگیرا یەكسەر لە هۆش خۆی چوو چونكە بەڕاستی دیتنی عزرائیل لەبەر گەورەیی و هەیبەتی ترسێكی زۆری هەیە ناخۆشیەكە دێتە ڕێمان چونكە شێوەی دورست بوونەكەی هەتا بڵێی بەسام و ترسناكە جا كابرا فەرمووی ئەو مردووە نەجاتی بوو جارێكیتر ملك الموت نابینیێ تەواو مردن یەك جارە كە ئێمە دەیبینین.

دووەم: مصیبەت فەرموی تازەنەجاتی بوو لە ئەزیەت و ئازاری روح كێشان چونكە مردن یەك جارە ئەبرێتەوە هەریەك جارانیش روحی مرۆڤ ئەكیشریێ هەتا فەرموی نەجاتی بوو لەو مصیبەتەش. سێیەم: كە لە سوءالخاتمە رزگاری بوو جا با تۆزێك لەو خاڵە بوەستین ئێمە رۆژێكمان لە پێشە كاتێك حەزرەتی ملك الموت ئەگاتە سەرمان روحمان بكێشێ دەبینین ئاخیر كاتمانە لە ژیان ئاخیر لەحزەی ژیانت لێرەو مصیری قیامەتت بەدیار دەكەویێ لە شوێنێك بی یاخود لە ماڵی لە هەر جێگایەك بی كە عومرت تەواو بوو ملك الموت رووحت ئەكێشێ ئەو كات ئاخیر لەحزەی ژیانت لە زارت بێتە دەریێ لە چ حاڵەتێك بمری ئەوە مصیری دوا رۆژت بەدیار دەخا بۆ خۆت لە ناو فیردەوس جنە العدن لەگەڵ هەموو بەهەشتیەكان دا دەژی یان ئەوەتا لە جەهەنەمیەكانی یا ئەوەتا لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) وە لەگەڵ ئەبوبكر و عوسمان و عومەر و علی و سوهیب یاخود ئەوەتا لە جەهەنەمی لەگەڵ ئەبووجەهل و فیرعەون و هەموو كافرەكان لە جەهەنەمدا ژیان ئەبەیتەسەر ئەوەی تەحدیدی دوا

رۆژت دەکا تەحدیدی موستەقبەلێکی خۆش یان ناخۆش دەکا ئەو لەحزەی ناخیری ژیانتە بۆیە پیاو چاکەکان و ئەولیاکان و صحابەکان هەموو لەو لەحزەیە دەترسان هەموو کات لە فکریان بوو ئەیان ووت نازانین کاتێك ملك الموت دێ ئایەئێمە لەچ لەحزەی ژیان بین لە حالەتێکی باش وچاکە داین یاخود لەکاتێکی خراپ بین کە خودای گەورە پێ ی ناخۆشە هیچ ئاگامان لە خۆمان نی یە بەکەیفی خۆمان ئەگەرێن وئەسورێن نازانین کاتێك کە ملك الموت دێ رووحت بکێشی لەوانەیە لەفکری خۆی ئەتەوێ گوناحێك ئەنجام بدەی جابۆیە کاتێك عیزرائیل لەسەرمان حازر دەبێ لەکاتێکی ئەوا بین کەخودای گەورەپێ ی خۆشبێ جا بەراستی سوء الخاتمە و حسن الخاتمە دوو بابەتی زۆر گرنگە ئەوەیە کە موسلمانەکانی ترساندوە ئینسان ئەبێ بۆ خۆی لەو ساتانە زۆر وریابێ چونکە تۆ کەتۆبەکاری پەیمان و بەلێنت داوەتە خودای گەورە کە گوناح نەکەی گرنك ئەوەیە تۆ بەئیمانەوە بمری راستە تۆ تۆبەت کردوە بەلاَم ئەو تۆبەیی تۆ چۆن بەکەکلت دێ قیامەت چۆن دەتوانی بەو تۆبەیەوە بەو استغفارەی بچێتە خزمەت خودای رب العالمین دەبێ بەحسن الخاتمە بمری ئەبێ لەسەر شێوەیەکی وا بمری کە خودای گەورە وە پێغەمبەر (ﷺ) پێان خۆشە جا رۆژێکیان کەسێك مردبوو یەکێك ووتی بۆکێ ی ئەبەن ئەوەکێ یە أبو دەردا یەك لە صحابەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو وەلاَمی دایەوە فەرموی ئەوە تۆی ئەگەر پێشت ناخۆشە منم چونکە خودای گەورە ئەفەرموێت(انك میت و انهم میتون) واتە ئەی محمد(ﷺ) تۆ ئەمری و ئەوانیش مردوون ئەو مردوە

تۆی ئەگەر پێشت ناخۆشە کە ئەڵێم تۆی منم چونکە تۆومن هەر دەمرین کەوا هەر مردیەك ئەبەنە قەبرستان وابزانە تۆی وا لە ناو دارەبازەکەی ئەتبەنە سەر قەبران دەی کەواتە ئێستا چەند ماوەیەکت ماوە کە بمری ئاگات لەو ساتانەی ژیانت بێ کێ نالی چەند رۆژ و سەعاتێکت ماوە لە ژیانت ئاگات لەو رۆژ و سەعاتەبێ جا پێم خۆشە بزانیت نیشانەکانی ئاخیر خێری چی یە چەند نیشانەێك هەیە کە ژمارەیان ٢٠ نیشانەیە. هەر کەسێك بمرێ وە یەکێك لەو نیشانانەی تێدابەدی بکرێ ئەوە ئاخیر خێر بوە(حسن الغاتمە)یە جێگای بەهەشتە انشاالله جا ئازیزانم ئێمە با بگەرێین و هەوڵ بدەین بزانین یەکێك لەو (٢٠) نیشانەمان تێدایە بۆ ئەوەی کاتێك کە ملك الموت دێ بۆ روحکێشانت بەشارەی بەهەشتت پێبدا بەشارەی رەزامەندی خودای گەورە بەشارەی ئەوەی کاتێك کە ملك الموت دێت رووحت بکێشێ ئەڵێ وەرە دەرێ ئەی روحی پاك و بێگەرد لەو لاشە پاکە بەرەو رەزامەندی خوداو بەهەشتی بەرین وەرە نەوەك پێت بڵێ ئەی روحی پیس خە بیث ئەی روحی پیسی بۆگەن وەرە دەرێ لەو لاشە بۆگەنییە چونکە کاتێ کەئەجەلت هات لە حالەتێکی زۆر نارێك دابووی لە جێگای ناشەرعی بوویت وەرە دەرێ ئەی روح بەرەو غەزەبی خوداو بەرەو خەشم و تورەی خودا بزانە ئەم دوو حالەتە چەند جیاوازە بۆیە دەڵێم مرۆڤ دەبێ هەوڵبدا لەو حالەتانەی کە باسیان ئەکەم هەوڵبدا باشەکەیان هەڵبژێرە بۆ ئەوەی کە ملك الموت هات تۆ انشا الله حازربی بۆ لیقای خودا بەروویەکی سپی و روحەکی خاوێن و دڵێکی خۆش:

- یەكەم حالەت ئەوەیە كاتێك ملائیكەتەكانت دێت بەشارەتی بەهەشت ورەحمەتی و لێ خۆشبونی خودای گەورەت پێی بدەن ئەمە كەسێك ئەبێ هەمووكات سووربێ لەسەر چاكە لەسەر كردەوەی باش لەسەر عیبادەتەكانی ئەبێ ئەو تەوبەی كە كردووتە لەفكر نەكەی هەر لەبیرت بێ پیاو چاكەكانی پێشوو كاتێك كە تەوبەیان دەكرد شتێكیان لە پشتیان دەبەست جالە هەر شوێنێك بونایە دەستیان پێوە ئەگرت ئەگەر بیان وویستبا گوناهێك بكەن یەكسەر تەماشای پەروكەیان ئەكرد ئەیان ووت خۆئێمە پەیمان و بەلێنمان بەخودای گەورە داوە تەوبەمان كردووە بۆیە پەڕۆیەمان بەستوە ئەومان كردۆتە شاهید لەسەر خۆمان تا چیتر گوناح نەكەین و تەوبەو بەلێنەكەمان كە بەخودا داوە بەبیربێتەوە بۆیە كاتێك ئەو ملائیكەتانە دێن بۆ روح كێشان بەشارەتی بەهەشتیان پێدایت ئەوە نیشانەی حسن الخاتمە و ئاخیر خێریە یەكێك لە حالەتی روح كێشان پێكەنینە زۆر پیاوی چاك و ئیماندار كاتێك كە روحی داوە پێكەنیوە یەك لەوانە عومەری كوری عبدالعزیز كە مندالی زۆر هەبوە كاتێك كە روحی خەریكی دەرچوون بوو بە مندالەكانی خۆی ووت ئێوە برۆنە دەرێ چونكە میوانێكی زۆر هاتیە جێگای ئێوە نابێ پاشان میوانەكانیش هەمووی خەلیفەكان بون ئەبو بەكرو عومەرو عوسمان و علی بوون لەگەل فریشتەیەكی زۆر هاتبوون پێشوازی ئەو روحە پاكەیان دەكرد خودای گەورە دەفەرمووێ ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ﴾ فصلت:٣٠ واتە ئەو كەسانەی ووتیان خودا ألله مانە وەعدو بەلێن

نوێ ئەکەنەوە بۆ بەردەوام بوون لەسەر ئەو ریگایە فریشتەکان دائەبەزنە لایان چونکە بەردەوام بوون لەسەر ڕێگای راست ساردنەبوونەوە لە ئیمان واتە ئەو کەسانەی وتیان خودا(الله) مانە بەڵێن و پەیمانیان بۆ خودای گەورە نۆێ کردەوە(ثُمَّ اسْتَقَامُوا) ساردنە بوونەوە لەم پەیمان و عەقیدەیەوە بەردەوام بوون و خۆراگربوون وە دووربون لە تاوان و سەرپێچی گوناح و مەعسیەت و نەفس و شەیتان وەی لێ نەکردن کە لەو ریگایە ڕاستە لابدەن(تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ) فریشتەی خودا دێنەلایان دائەبەزن دائەنیشن لایان پێان دەڵێن﴿أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾ فصلت:٣٠ واتە خودای گەورە دەفەرموێ نەترسن ڕاستە مردنە حاڵەتێکی ناخۆشە بەڵام نەکەی بترسی و خەمبارێش بی چونکە لەبەر ئەوەی ﴿وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾ فصلت:٣٠ واتە مژدەت لێ بێت لە لایەن خودای گەورە جێگایەکی زۆر خوشی دلناوی بەهەشتێکی پان و بەرین ئەو بەهەشتەی کە خودای گەورە وەعدی داوە بەئیمان داران خودای گەورە دەفەرموێ ﴿أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ﴾ فصلت:٣١ واتە ئیمە برادەری ئێوەین ئەولیاتانین کەسێك برادەری فریشتەبێ دەبێ دووربێ لە گوناح بەڵام کەسێك گوناح بکا فریشتە نابێتە برادەری شەیتان برادەرایەتی دەکات پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ هەر کەسێك درۆێك بکا ملائکەی سەرشانی میلێك لێیّ ی دوور ئەکەونەوە لە بەریەك درۆ چونکە بۆنێکی ناخۆشی لێ ی پەیدا دەبێ جا ئەگەر لەسەر درۆیەك ئاوا لێ ی دوور کەوێتەوە ئەگەر ئەزەر و بوختان و گوناح بکەی

یەك فریشتە برادەرایەتیت ناكەن هەموو گوناحەكانت تۆمار ئەكەن لێت تۆرە ئەبن بەلاَم شەیتان و براكانی شەیتان ئەوانە دۆست و برادەرایەتیت ئەكەن دەی كەواتە تۆ هەركاتێك لە مالەوە لە بازار لە هەرشوێنێك بی هەمیشە زكری خودات لەسەر زاری بیّ هەموو كات یادی خودا بكەین و زیكر و تەسبیحات بكەین فریشتەكان دەفەرمون(نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ ) ئێمە برادەری ئێوەین(فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا) لە دونیاش دابوین(وَفِي الْآخِرَةِ) هەم لە رۆژی قیامەتیشدا هەر لەگەلّ تۆین و چێت ناهێلین﴿وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِي أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ﴾ فصلت:٣١ واتە لەو بەهەشتەی كە ئەچیتە ناوی ئەوەی نەفست ئارەزوو بكا هەیە ئەوەی داوا لەو بەهەشتە بۆت حازر كراوە﴿نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ﴾ فصلت:٣٢ واتە ئەوە پاداشتی خودایە كە خودایەكی بەخشندەو بە رەحمە.

دووەم: نیشانە ئەوەیە كە پێش مردنت و روح كێشانت شەهادە بێنی كاتێك دەمری بلّیّ لا اله الا الله محمد رسول الله(ﷺ) چونكە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرمویّ (من كان اخر كلامه لا اله الا الله دخل الجنه) واتە هەر كەسێك ئاخیری ووشەی لا اله الا الله بیّ دەچێتە بەهەشت بۆیە سونەتە كاتێك كەسێك دەمریّ لەلای دابنیشیت و هەر بلّیّ لا اله الا الله یاخود زۆر زكری خودا بكەیت ئەوەی ئاخیر قسەو ئاخیر ووشەی لا اله الا الله بە ئیمانەوە ئەچێتە خزمەت خودا و وە خودای گەورەش ئەیخاتە بەهەشتی خۆیەوە خودا ئەم جۆرە مردنە بە قسمەت هەموو لایەكمان بكات و كۆتا ووتارمان لە دونیادا لا اله الا الله بێت.

سێیەم: ئەگەر کەسێك بمرێت و نێوچەوانی ئارەقە بکاتن ئەوە نیشانەی ئیمانداریەتیە چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ(موت المؤمن بعرق الجبين) واتە کەسێك کە بەئیمانەوە بمرێت ئەوەیە کە مرد هەردوولای نێوچەوانی ئارەقە بکا.

چوارەم لە رۆژ و شەوی هەینی بمری لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرموێ(ما من مسلم يموت يوم الجمعه أو ليله جمعه وقاه الله فينته القبر) واتە هەر موسلمانێك لە شەو و رۆژی هەینی بمرێ ئەوە خودای گەورە لە ئەشکەنجەی قەبر ئەیپارێزێ ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە ئەو حسن الخاتمەیە وە ئاخیری خێر بووە چونکە رۆژی هەینی مرووەکان ئاگادارن کە زیندوەکان دەچنە زیارەتیان مردوان رۆژی هەینی ئاگادارن کاتێك هەر کەسێك بچێتە لایان دووعایان بۆ بکەن یا سەلامێکیان لێ بکەن ئەو مردوانە ئاگادارن(ئیمامی ابن القيم) لە کتێبی روح چەند رووداوێکمان بۆ ئەگێرێتەوە یەك لەو رووداوانە ئەوەیە کە کورێك دایکێکی زۆر بە دینی هەبوو ناویان نابوو راهیبەکە دایکی ئەم کورە مرد کورەکە زوو زوو ئەچووە سەر قەبران بۆ زیارەتی دایکی پاشان ماوەیەك نەچووە سەر قەبران بۆ ماوەی یەك مانگ رۆژێکیان چووە سەر قەبری دایکی چەندووعایەکی بۆ کرد لە خودای گەورە پارایەوە کەوا عەزابی نەدا ناو قەبری بۆ رووناك بکات پاشان شەوێك لە خەودا بینی ووتی کورم ئەوە بۆ یەك مانگە نەهاتیتەلام ووتی بۆ دایە گیان ئێوە ئاگادارن کاتێك ئێمە دێنە سەر قەبران ووتی بەلێ رۆژی هەینی هەتا شەوی شەممە ئێمە ئاگامان لێیە

هەر کەسێك دیتە سەر قەبران ووتی واللەهی هەموو جارێك کە تۆ دەهاتیتەلام مردووەکان هەموویان ئەیان ووت خۆشی لە خۆت ئەوە کورەکەت هات و سەدەقەو خێرو خێراتی بۆ هێنای جا بە ڕاستی مردوان چاویان لە ئێمەیە بەڵکو خێرو چاکەیان بۆ بنێرین.

پێنجەم: لە مەیدانی شەڕ لە غەزادا شەهیدبی ئەمەش نمونەیەکە عیکریمەی کوری ئەبی جەهل، ئەبو جەهل پیاوێکی کافر و خراپ بوو ئەو کافرە سەر کەشەکە زۆر ئەزیەتی پێغەمبەری ئەدا زۆر زۆر بەریەرکانی ی لەگەلی پێغەمبەردا دەکرد(ﷺ) بە کافریش مرد عیکریمەی کوریش زۆر لە بابی کەلە رەقتربوو هەتا کاتێك فەتحی مەکە کرا نەبوە موسلمان کە فەتحی مەکە ساڵی(٩) هجری بوو خۆی ئامادە کرد لەگەل کومەلێك گەنج لەوانە کوری خۆی بوو ناوی عومەر بوو خۆیان ئامادە کرد ووتیان ئێمە شەردەکەین لەگەل پێغەمبەر(ﷺ) لێنا گەرێین محمد(ﷺ) بێتە مەککە لەو کاتەدا کە پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتە مەککە عیکریمە لەگەل جەماعەتی(١٠٠) کەس بوون خالیدی کوری وەلید بەرەنگاریان هات لەوکات شەرێکی زۆر مەردانەی کرد هەموویانی ئاش بەتاڵیان لێ کرد هەموویان هەلاتن عیکریمەش هەلات بەلام بۆ کوێ هەڵدێ چونکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی(من دخل بيته فهو أمين ومن دخل المسجد فهو أمين ومن دخل دائره أبوسفيان فهو أمين) واتە هەر کەسێك بچێتە ماڵی خۆی ئەوە سەلامەت ئەبێت لە کوشتن هەر کەسێك بچێتە مزگەوتی حرام ئامنە هەر کەسێك بچێتە ماڵی أبوسیفانی ئەوە ئامنە و سەلامەتە تەنها کۆمەڵە

کەسێك نەبێ بڕیاری لە سێدارەدانی بۆدان فەرمووی(أقتلوهم ولو رايتهم معليقين فى أستار الكعبة) واتە ئەگەر دیتان خۆیان بە دیواری کعبە هەلواسیبوو رەحمیان پێ مەکەن بیان کوژن یەك لەوان عیکریمە بوو بڕیاری کوشتنی بۆ درا بەڵام حیکمەتی خودای گەورە تەماشاکە کاتێك عیکریمە هەڵات بەرەو یەمەن رۆیشت لە ریگا سواری کەشتی بوو کە بچێت ماوەیەك لە حەبەشە بمێنێتەوە بەس لەبەر ئەوە ئیمان نەهێنێ خاك و وڵات وکەس و کار و عەشیرتی بەجێ هێشت بەس لەبەر ئەوەی ئیمان بە محمد نەهێنێ لە ناو دەریاکە کە ئەچوو بۆ حەبەشە لاقاو هەڵسا تەوژمی ئاو هات و ئەو دەریاییە وای کرد وەخت بوو کەشتیەکە وەرگەرێ یەك لەوان ووتی خەڵکینە لە خودا بپارێنەوە هاوار بکەن لەبەر ئەوە بت و سەنەم لە هاوارتان نایێ یەکسەر عیکریمە ووتی خودایە بەس ئەم جارە نەجاتم بدە بەڵێن بێ دەستم لە ناو دەستی پێغەمبەرەکەت بنێم و ئیمانی پێ بینم بەس نەجاتم بدە جابە ئەمری خودا نەمردن هەموویان رزگاریان بوو بەسەلامەتی گەڕانەوە جا عیکریمە هاتەوە نەرۆیشت بۆ حەبەشە جالەو کاتەی ژنەکەی عیکریمە ئەمانی لە پێغەمبەر(ﷺ) وەرگرتبوو داوای لە پێغەمبەر کرد(ﷺ) کەوا مێردەکەی ببەخشێ تاکو بیگەرێنێتەوە پێغەمبەر(ﷺ) ئەمانی پێدا زۆر دڵخوش بوو ووتی ئاخیر نیشانەیەکم بدەێ بۆی ببەم پێغەمبەر(ﷺ) نیشانەیەکی پێ دا پاشان خێزانی عیکریمە لەگەڵ بەندەکە(عبد) خۆی بەرێ کەوت بۆلای عیکریمە بچێت بەڵام بەندەکە زۆر هیچ و پوچ بوو لە رێگا ویستی دەست درێژی بکاتە

سەر ژنەكە بەڵام ژنەكە زۆر عاقڵ بوو بەقسەی خۆش و خواردن و پارەی پێدا تاوانی لێ بێنی هەتا گەیشتنە ماڵێك ووتی ئەوە بەندەی منە بەڵام ویستی دەست درێژیم بكاتە سەر ئەوانیش زۆر مەرد بوون یەكسەر بەندەكەیان گرت تاوەكوو عیكریمە هاتەوە ئەوجا ژنەكەی ووتی وەرەوە پێغەمبەر(ﷺ) ئەمانی دایێ ئەمەش نیشانەكەیە بەڵام ئەو بەندەیە ویستی دەست درێژیم بكاتە سەر عیكریمە پێش ئەوەی موسڵمان بێ یەكسەر بەندەكەی كوشت وەبە ئەمانی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر دڵخۆش بوو پاشان عیكریمە هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) بەڵێن و پەیمانی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) بوە موسڵمان جا خەڵك ئەیان ووت باوكی ئەو كورە زۆر موجریم بوو خەڵك جنێو بە باوكم ئەدەن بە ابو جەهل پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی خەڵكینە جنێو بە مردوان مەدەن چونكە ئەزیەتە لە بۆ زیندوەكان عیكریمە كە باوكی كافرو موجریم بوو بەڵام ئەو چیبكا ئەویش حەزی دەكرد باوكی موسڵمان بوایە لەو كاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) زۆر گرنگی بە عیكریمە ئەدا عیكریمە شەو و رۆژ خەریكی قورئان خوێندن و عیبادەت كردن بوو پێغەمبەر(ﷺ) كردیە والی لە شوێنێك كە خزمەتی موسڵمانان بكات لە زەمانی ئیمامی ابو بكر چەند شەرێك پەیدا بوو كە مانعوزەكات بوون عیكریمە لەم شەرانەدا هەمووی بەشداری كرد هەتا شەری یەرموك لە شەری یەرموك عیكریمە بەخۆیی و بە مامی و كوری و چەند كۆمەڵەیەك رۆیشتن پێش ئەوەی شەر دەست پێبكا فەرموی(من یبایعنی علی الموت) واتە كێ پەیمانی مردنم لەگەڵ ئەبەستێ كە برۆیین و نەگەرێینەوە ئەو

عیکریمەی کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کوشتنی بۆدا بوو ئێستا وابە حوسن الخاتمە ئەمری هاوار ئەکا(من یبایعنی علی الموت) هێرشیان کردوو هەموویان شەهید بوون لەو سەد کەسە یەك کەس مابوو هەموویان لە مەیدانی غەزادا لە مەیدانی شەر شەهید بوون ئەوە حوسن الخاتمەیە بە خۆیێ و کورەکەی شەهید بوون جا ئینسان بە خۆی دەتوانی مسیری خۆی دیاری بکات حەز بکەین لەکاتی خێرو چاکەدا بمرین یان لەناو گوناح و بێ شەرعی دا.

شەشەم: هەر کەسێك بە نەخۆشی تاعون بمرێ ئەوە بە شەهید حیسابە بە حوسن الخاتمە مردوە بەو مەرجەی موسڵمان و دیندار بن.

حەوتەم: هەر کەسێك بەسك ئێشان بمرێت ئەوەش بە شەهید حیسابە.

هەشتەم: خنکان لەناو ئاو ئەوەش شەهیدە انشا الله ئەوانە هەموویان بە حوسن الخاتمە حیسابە لەبەر ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویە هاوەڵەکانی ئایا شەهید چەندن لای ئێوە؟ هاوەڵەکان فەرموویان(من قتل فی سبیل الله فهو شهید) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئەگەر وابێ شەهیدەکانی ئومەتی من کەمن نەخێر بەڵکو(من قتیل فی سبیل الله فهو شهید)(ومن مات فی طاعون فهو شهید)(ومن مات فی البطن فهو شهید، والغریق شهید) واتە ئەوانە هەموویان شەهیدن و بە حوسن الخاتمە حیساب ئەکرێن بە مەرجێ موسڵمان بن.

نۆیەم: هەرکەسێك ئەگەر دیوارێك یان شتێکی بەسەردا بەربێتەوە لەژێر دیوارەکە بمرێت خودای گەورە بە شەهیدی قەبول دەکا.

دەیەم: ئەو ئافرەتەی لەسەر مندالّ بوون بمرێ ئەگەر منالّەکەش نەمرێ ئەوە ئەو ئافرەتە شەهیدەو بە حوسن الخاتمەیە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموی ئەو ئافرەتەی لەسەر منالّ دەمرێ شەهیدەو هەتا ئەو منالّەی کە دەمری بە بچووکی هێشتا ناوکی نەکراوەتەوە ئەگەر لە دۆزەخ بێ بەو ناوکەی کە نەبراوە دایکی لە دۆزەخ دێنێتە دەرەوە فەرمودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێ خودای گەورە لە رۆژی قیامەت ئەو منالانەی مردون نەگەیشتونەتە تەمەنی(١٥) سالّی یان بالغ نەبوونە هەموویان دەبەن بۆ بەهەشت جا هەیە تەمەنی حەفتەیەکە یان مانگێکە یاخود چەند سالێکە گەورە تر یان بچووکتر هەموویان دەگرین دەڵێن ناچینە بەهەشت هەتا دایکمان لەگەڵمان بێن بۆ بەهەشت بەبێ دایك و باوکمان ناچینە بەهەشت جا خودای گەورە دەفەرموێ هەر یەکە برۆن دایك و باوکتان بێنن و بیبەنە بەهەشت. ئەمەش لە عەفووکەرەم و لطفی خودایە بە بەندەکانی خۆی لە رۆژی قیامەتدا.

یازدەهەم: هەرکەسێك بە ئاگر بسوتێ و بمرێ بەلاّم بەخۆی خۆی نەسوتاندبێ ئەوەش شەهیدە بە حوسن الخاتمە حیسابە یا بە کارەبا بمرێ شەهیدە.

دوازدەهەم: نەخۆشیەك هەیە پێی دەڵێن(التهاب الرئه) واتە بن پەراسوی ئیلتهاب دەكا ئێشو ژانێكی زۆری تێدایە ئەوەش ئەگەر بەو ئازارە بمرێ بە شەهید حیسابە.

سێزدەهەم: هەر كەسێك بە نەخۆشی سیل بمرێ ئەوەش شەهیدە.

چواردەهەم: هەر كەسێ لەسەر ماڵی خۆی بكوژرێ ئەوەش شەهیدە.

پازدەهەم: هەر كەسێك لەسەر ئەهل و ناموس بكوژرێ شەهیدە.

شازدەهەم: هەركەسێك لەسەر دین و عەقیدەی ئیسلام بكوژرێ شەهیدەو حوسن الخاتمە حیسابە.

حەڤدەهەم: ئەو كەسەی حەرەسیات بگرێ لە راهی خودا ئەگەر لە جێگای خۆی لە نوقتەی حەرەسیات بمرێ ئەوەش شەهیدە.

هەژدەهەم و نۆزدەهەم: ئەو كەسەی لەسەر كردەوەی باش بمرێ یان بۆ كارێكی خێر بچێ لە رێگا بمرێ ئەمەش بە حوسن الخاتمە و ئاخیر خێری مردووە. چونكە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ هەر كەسێك لەسەر ئیشێكی باش بمرێ لەسەر كردەوەیەكی باش لە كاتی بە رۆژو بێ یا لەناو نوێژكردن بمرێ(دخل الجنه) دەچێتە بەهەشت یان بۆ مزگەوت بچێ یا بۆ حەج و عمرە بچێ یان بۆ حەج كردن بچێ لە رێگا بمرێ ئەوە لە پارێزگاروو خمانی خودا دایەوە بە ئاخیر خێری مردووە مرۆڤ دەبێ زۆر ئاگای لە دەقەو ساتی ژیانی خۆی بێ بەردەوام بێ لەسەر تاعەت و عیبادەت كردن خۆت مەزبووت بكە لە دیارو نادیار دوعای زۆر بكە خودای گەورە بە

حوسن الخاتمە روحت بکێشیَ جا ئازیزانم بۆ ئەوەی بە حوسن الخاتمە بمرین بتوانین لەو نۆزدە خاڵە بین یەکەم دائیمەن لە تاعەتدا بین دووەم هەمیشە خەریکی دووعا کردن بیَ انشا الله بە حوسن الخاتمە ئەمرین بەڵام سوء ئەلخاتمە ئاخیر شەری چەند خالێکە یەکەم ئاخیر شەری دوو جۆرە یان ئەوتا کەسێك بە کافری و بیَ ئیمانی بمریَ ئەوە کافرە ئەبەدیە لە جەهەنەم خودا بمانپارێزیَ.

یان هەندێك هەیە گوناحی زۆر کردوە تەعەودی کردوە لەسەر گوناح کردن کاتێك کە دەمری بەس گوناحەکانی لەسەر زارە ئەوانەش چییان بەسەردیَ لە کاتی مردن ناتوانن شهادە بێنن جا هەر کەسێك لە کاتی مردن نەتوانی شهادە بێنیَ ئەوە نیشانەی ئاخیر شەریەتی کە ئاخیری خێر نەبووە جا زۆر پێویستە لەو کاتەی کەسێك دەمریَ زۆر شەهادەی پێی بهێنین چونکە لەوکاتەی کەسێك دەمریَ شەیتان خۆی دەکاتە دایکی وباوکی یا کەسێکی خۆشەویستی دەڵی بمرە لەسەر دینی ی گاورەکان وەبە مەسیحی بمرە لەسەر دینی نەصرانیی بمرە دینێکی زۆر ڕاستە وادەزانی باوکتە یاخود دایکتە ئەڵی کوڕم بمرە لەسەر دینی یەهوودی بمرە باشترین دینە شەیتان لەوکاتە وای لیَ دەکا هەتا بەکافری بمریَ جا لەوکاتە چ بەکەڵك دیَ ئەو موسڵمانانەی کەلەلای دانیشتوون زۆر زکری خودا بکەن سورەتی یاسین بخوێنین بۆ ئەوەی ئەو کەسە وشەی (لااله الا الله)ی وەبیربێتەوە لەسەر لا اله الا الله بمری لەسەر ئاخیر خێری ژیان بەجیَ بهێلێت جا دەبیَ زۆر وریای خۆمان بین لەوکاتە شەیتان زەفەرمان پیَ

ئەبا ئەو کەسەی ئازاری دایك و باوکی بدا شهادە نایێتە سەر زاری رووداوەکەی عەڵقەمەی کە ئازاری دایکی دابوو پێغەمبەر(ﷺ) دوو هاوڵەکەی ناردەلای تاوەکو ئەو کوڕە لەسەر لااله الا الله بمرێ بەڵام علقمه نەیتوانی شهادە بێنێ هەتا پێغەمبەر(ﷺ) بەدایکی ووت گەردەنی ئازاد بکات ئەوجا توانی شەهادە بێنێ جا بۆیە ئەڵێم مرۆڤ ئەبێ زۆر ئاگای لە دەقەو سەعات وساتی ژیانی خۆی بێ هەمیشە لە گوناح و تاوان خۆی بپارێزی نەوەك لەسەر گوناح بمرێ.

ئازیزانم بابزانین هۆی ئەوانە چی یە کە دەبێتە مایەی ئاخیر شەری.

یەکەم: ئەو کەسەی عەقیدەکی تەواوی نەبێ بەئاخیر شەر دەمرێ ئەبێ عەقیدەکی تەواوی هەبێ هیچ شك و گومانی تێدانەبێ وە مەرجەکانی باوەری باس کراوە لە وانەکانی گەشتێك بە ناخی مرۆڤ برۆ تەماشای بکە.

دووەم: هەرکەسێك بەردەوام بێ لەسەر تاوان و گوناح ئەوە دەبێتە مایەی ئەوەی بە ئاخیر شەری توشی بێ بمرێ لەسەر ئەم گوناهانە هەیانە خۆشەویستی دونیا وای لێدەکات توشی ئاخیر شەرێ بێ.

سێ یەم: هەر کەسێك لابدات لەسەر بەردەوامی کاری چاك ئەوەمایەی ئەوەیە کە توشی سوء الخاتمه بێ

*تەماشاکە کاتێك شەیتان لەگەڵ فریشتەکان خودای ئەبەرست.

*عیبادەتی دەکرد بەڵام کەلای دا لەسەر بەر دەوامی .

*ئاخیر شەری توش بوو وەبەر لە عنەتی خودا کەوت نمونە ئەو ڕاهیبەی بەنی اسرائیلیان کە عابید بوو ئەو ڕاهیبە لە ئەشکەوتێك خودای

ئەپەرست كاتێك ئەوسێ برایە كە چوون بۆ غەزا خۆشكەكەیان بردەلای ڕاهیبەكە كەلەلای بمێنێتەوە تاكو ئەگەڕێتەوە جا ئەوە بوو خوشكیان لای ڕاهیبەكە جێ هێشت ئینجا شەیتان ڕاهیبەكەی هەڵخەلەتاند كەبچێ قسەی لەگەڵ كچەكە بكا پاشان توشی نەزەری كرد توشی زینای كرد كچەكە زگی بوو شەیتان ووتی بیكوژە باخەڵك نەزانن بڵێ خۆی مرد پاشان براكانی زانیان خوشكیان كوژرایە ڕاهیبەكەیان گرت و شەیتان چوەلای بە ڕاهیبەكەی ووت یەك سوجدەم بۆ ببە ڕزگارت دەكەم ووتی ئاخر بەسراومەتەوە شەیتان ووتی تەنها سەرت بۆم نەوی بكە جا عابیدەكە وای كرد سەری بۆ شەیتان دابەزاند یەكسەر لە سیدارەیان داو بەكافری مرد تەماشا شەیتان هەمووی پێكرد بەكافریش مرد ئەو عابیدەی كەسی ساڵ بە تەنها خودا پەرستی ئەكرد شەیتان هەڵی خەلەتاند ئەڵێن لە میسر موئەزینێك هەبوو بانگی ئەدا زۆر پیاوێكی چاك بوو ڕۆژێكیان چووە سەربانی مزگەوت بۆ ئەوەی بانگ بداماڵێكی نەصرانی جیرانی مزگەوت بوو جالەوكاتە ئافرەتێك لەسەربان شمەكی هەڵدەخست ئەو پیاوە كە دیتی دڵی كەوتەسەر ڕۆژێكیان چووە ماڵی ئافرەتەكەو پێ ی ووت بۆ تۆ هاتوم كچەكە ووتی ئاخر من مەسیحیم تۆش موسڵمانی باوكم ڕازی نابێ ئیلا ئەگەر ببیە نەصرانی ووتی باشە دەبمە مەسیحی بەس تۆ بۆمن بی دەبمە نەصرانی جا پێش ئەوەی بیگواستەوە بەچەند سەعاتێك پێشتریش اعلانی بەگاوری خۆی بەیان كرد لەلای قەش لە پێش ماڵی ئافرەتەكە بەربووە یەكسەر مرد ئاخیری بەكافری مرد ئازیزانم مرۆڤ ئەبێ زۆر ئاگای

له خۆی بێ ئاخر شەری مالی موسلمان وێران ئەکا هەم دونیای له دەست چوو هەم قیامەتیشی لێ تال بوو بۆیه پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ پیاو هەیه عیبادەت دەکا وا ئەزانی له ئەهلی بەهەشته بەلام نازانی ئاخیری خۆی کافر ئەکاو له ئەهلی دۆزەخه پیاویش هەیه عیبادەتی نەکردوه بەلام ئاخێری خێر ئەبێ تۆبەدەکا هەتا دەمری تۆبەکەی ناشکێنێ خودای گەورە دەیباته بەهەشت جا هیوادارم لەو خالانه دەست پێوه بگرین بۆ ئەوەی ئەگەر بمرین بەروویەکی سپی بەخزمەت خودای گەورە بگەین انشا ألله به بەهەشت شادبین أمین أمین والحمد الله رب العالمین و صلی الله علی محمد وعلی أله و صحبه أجمعین.

# ٣- بەخەبەرهاتن

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على حبيبنا محمد وعلى اله وصحبه أجمعين السلام عليكم ورحمة الله و بركاته.

پێشەكی خۆشەویستانم خۆشحالم كە لە دەرسی ئەم جارە باسێكی زۆر گرنگە ئەویش بەخەبەرهاتنە. ئازیزانم لای كەسمان شاراوەنیە كە هەر كاتیَ مرۆڤ توشی ناخۆشیەك بوو توشی گرانی و نەهاتی و كەم بارانی بوو توشی هەر غەم و خەفەتێك هات ئەوە هۆكارەكە لە زاتی مرۆڤ كەیە نەك لە بەرنامەی ئیسلام و قورئان و خودا و پێغەمبەر(ﷺ) نی یە ئەوە شتێكی بەڵگە نەویستە كەس ناتوانیَ نوكوولی لیَ بكا یان موناقشەی تێدا بكە چونكە هەر زاتی ئینسانەكە بۆ خۆی كەمتەرخەم و نارێك و گوناح و تاوان ئەنجام ئەوات هەر مرۆڤەكەیە كەوا دەكا توشی زروفێكی ئاوا ناخۆش و نائەموار بێتە پێش هەروەك ئیمامی مالیك دەفەرمویَ(لا يصلح أخر هذة أمه ألا بما صلح أولها) واتە ئاخیری ئەو ئۆمەتە كە ئێمەینە چاك نابین و رێك نابین تاكو خۆمان چاك نەكەین بەو دەرمانەی كە ئەولی ئۆ مەتە خۆشی پیَ چاك كردوە. چۆن ئەوانەی كە لە زەمانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) چاك و پوخت بوون بەم شێوەیش ئێمە باش نەبین ئەوا ئەو ئۆمەتەش چاك و پوخت دەبن جا هۆی چ بوو ئەوان رێك بوون و چونكە

لەگەل خودای خۆیان ڕێك بوون و صالح بوون خودای گەورە ڕزق و ڕۆزیەکی باشی ئەدانێ بارانێکی زۆری بۆ ئەباراندی و ژیانێکی زۆر بە ئەمن و ئامانیشیان دەبردە سەر لەبەر ئەوەی ڕاست بوون لەگەڵ خودا لەگەڵ قورئان لەگەڵ محمد مصطفی(ﷺ) لەگەڵ نەفسی خۆشیان جا پێمان خۆشە ئێمەی موسڵمانانیش ئەو نهێنیە ئاشکرا بکەین هەوڵ بدەین هیمەت بکەین تا بتوانین ئەو پایەیە بە دەست بێنین و صالح بین لەبەر ئەوە کە صالح بووین خودای گەورە زەوی تەسلیمی تۆ دەکا دوژمن و خودا نەناس و کافرەکان سەر شۆر ئەکا موسڵمانان لە ئاژاوەیان دوور ئەکات﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ﴾ الانبياء:١٠٥ خودای گەورە دەفەرمووێ ئێمە لە کتابی زەبور کە پەیامی داودە نوسیتمان کە ئەم زەویە بە دەست صالحەکان ئەبێت و بە میراتی ئەگرن ئەگەر ئەمرۆ کافر بە میراتی گرتووە دیارە ئێمە چاك نین ئەگەر ئێمە چاك بین ئەوان وجودیان نی یە ئەگەر مۆم چەند کزە بەڵام تاریکی ڕانەماڵی تەنها ئەگەر یەك مۆمیش بێت هەر کاتێك بەندەکان صولحیان لەگەڵ خودا کرد چاك بوون ئەوە لەو کاتە خودای گەورەزەویشیان تەسلیم دەکات وە خۆشی خۆش گوزەرانیان بەقسمەت دەکات جا خۆشەویستانم یەکەمین شت بۆ ئەوەی ئێمە چاك بین بەتایبەتی ڕەمەزانان فورسەتە ئەبینین خەلك بەخۆیدا دەچێتەوە و لە خەوی غەفلەت بەئاگا دێت وموحاسەبەی نەفسی خۆی دەکا بۆیە پێویستە ئەوکات بەدەرفەت بزانین و بتوانین وەکو پیاو چاکانی پێشتر ڕەفتار بکەین ئەوان بە چەند قوناغدا

ڕۆیشتن تاکو و ئێمەش بە پایە پایە هەوڵ بدەین شوێن پێی ئەوان هەلگرین بەلکو وەکو ئەوان چاك ئەبین وە خودای گەورەش چۆن بۆوان کرد لەگەل ئەوانی کرد ئاواش لەگەل ئێمە بکات بۆ ئێمە بکات:پێویستە بۆ ئەوەی ئێمە کەسێکی صالح بین دەبێ زۆر بە جوانی لەو دینە پاکە کە ئیسلامە حاڵی بین ئەوە لە هەمووی گرنگترە چونکە هەر کەسێك لەو ئیسلامە حاڵی نەبێ یان بە هەڵە تێبگا ئەوە دەبێتە بەر بەستێك بۆ صالح بوون چونکە تۆ بۆ ئەوەی لە خودای گەورە بگەی پێویستە بۆ ئەوەی خودای گەورە مامەڵەی صالحانت لەگەڵ بکات کە لە دینەکەی خودای گەورە بگەی پاشان کە تێگەیشتی خۆت کامیلەن تەسلیمی رب العالمین بکەی هەر عیبادەتێك هاتە پێش هەر ئەمرێك هەر نەهێیك هاتە پێش بە مێشك و بیری خۆت لێکی نەدەیەوە بلێت بزانم ئەو عیبادەتە یان ئەو ئەمرە یان ئەو نەهییە سود و قازانجی چیە چونکە خودای گەورە بە إفعل و لاتفعل دەپەرستریێ خودای گەورە دەفەرموێ بیکە دەبێ بیکەی بەبێ ئەوەی لە حیکمەت و سودەکانی بزانی یا نەزانی چونکە تۆ عەبدی ئەو خودایەی ئەمرت پێ دەکا تۆ تاقی دەکاتەوە ئایا ئەو(إفعل و لاتفعل)ی جێ بە جێ دەکەی یانا ئایا فەرمانەکانی جێ بە جێ دەکەی وە نەهیەکانی وازی لێ دەهێنی جا هەر کاتێك مرۆڤ بە دوای حیکمەتی شت کەوت لێ ی کۆڵیەوە لە دوای فەلسەفەی ڕۆژ و نوێژ و زەکاتی کۆڵیەوە باشە ئەگەر عیبادەتێك هیچ فەلسەفەی نەزانی دەبێ بە گوێی خودای گەورە نەکەین باشە ئێمە نوێژی عیشامان کرد چوار رکاتە کێ ئەزانێ

حیکمەتی چیە چوار رکاتە نازانین دەی کە نازانین نابێ بەعەقلی خۆت بچیت بەندایەتی خودای گەورە بکەیت بەڵکو دەبێ خۆت تەسلیمی خودا بکەی بە هەموو عەقل و دڵ و هەموو ئەندامێکتەوە تەسلیمی خودای گەورە بیت خودای گەورە چی فەرمووە دەبێت جێ بە جێ بکەی بێ ئەوەی تۆ منجە منج بکەی یا خود لە دوای حیکمەت و شتە بەسوودەکانی بگەرێی جا بەراستی یاوەرانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەودوو جیلەی لە پاشەوانیش هاتبون هەر هەموویان کاتێك کە خودای گەورە ئەمرێکی پێ دەکردن کە قورئانیان ئەخوێندەوە کە کەلامی خودایە ئەمرێك یان نەهییەك یان فەرمانێکیان گوێیان لێبوایە جێ بە جێ یان ئەکرد بێ ئەوەی لە هیچ شتێك بپێچنەوە جا ئەو حاڵەتە زۆرە لە ناو ئێمە بەڕاستی ئێمە ئەبێ تەسلیمی خودای گەورە بین تەسلیمی فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بین نمونەیەك: جارێکیان پیاوێك ئەڵی لە جێگایەك ئاوم خواردەوە ئیجا ئەڵی بە پیاوێکم ووت کاکە گیان بە دەستی چەپ ئاو مەخۆوە ووتی ئەوە چی یە ئەوەندە دینت لە سەرمە قورس کردیە فەرقی چی یە چەپ و ڕاست ووتم کاکە چەپ و ڕاست فەرقی نی یە بەڵام سونەتی پێغەمبەر(ﷺ) ئاوایە شتی خراب و پیس پاکردنەوە بەدەستی چەپ ئەکرێ شتی پاك و چاك بەدەستی ڕاست ئەکری پێغەمبەر(ﷺ) تەنها تۆ تاقی دەکاتەوە ئایە تۆ بەگوێی ئەکەی یان نا ئەگەر نا دەست هەر دەستە هەردووکیان ئاوی پێ دەخورێتەوە بەڵام دڵی تۆ تاقی ئەکرێتەوە جا بەڕاستی لە هەموو ورد و درێژێیکدا تۆ لە حیکمەتی مەکۆڵەوە تەنها تۆ

ئامادەبە کە فەرمانی خودای گەورە جێ بە جێ بکەی سەیرکە خودای گەورە چ دەفەرموێ چۆن هەرەشەمان لێ دەکا﴿فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا﴾ النساء: ٦٥ واتە: بەخودای تۆ ئەی محمد(ﷺ) ئەوانە هیچیان ئیمانیان نیە(فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ) ئەوەی ئیمانی نەبا جێ ی دۆزەخە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئەواکێنە یارب العالمین ئەوانەی ئیمانیان نیە و ئیمانی نابەن خودا ئەفەرموی سوێند بە خودای تۆ یا محمد ئەوانە ئیمان نابەن تا بۆ هەموو کێشەکانیان نێنەلای تۆوە تۆ نەکەن بەحاکمی نێوان خۆیان و پاشان رازی بن بە حوکمەکەی تۆ هیچ گلەیەکیان لەگەڵ نەبێت نەوەك دوو کەس بچنەلای ماموستایەکی ئاینی شەرعەکیان بۆ بکا بڵێ تۆ ڕازی بڵێ واللەی بەو شەرعەڕازی نیمە کافر دەبێ ئاگای لە خۆی نەبێ کافر دەبێ هەر چەندە شەو نوێژیش بکا جا ئەوەیە موسلمانان دەبێ تەسلیمی خودا بن ئەوکات خودای گەورە هەرچیان بوێ بۆیان جێ بە جێ دەکا هەموو ڕزق و رۆزیشیان بۆ دەبارێنت زەلیل و زەبونیشیان ناکا جا بەڕاستی دەبێ ئێمە نەفسیەت دروست بکەین ئەو نەفسیەتە چۆن دروست ئەبێ بزانین پێغەمبەری خودا(ﷺ) چۆن لەنیو یاوەرەکانی دروست کرد تاکو ئێمەش ئەو نەفسیەتە موطیعة دروست بکەین ئەو لاشە و دڵ و فکرە موطیعة دروست بکەین ئیجا خودای گەورە پلەی صالحانمان پێ دەداو و هەروەها ڕەفتاری صالیحنیشمان لەگەڵ دەکا جالێرەدا ئەمە چەند خاڵە زۆر گرنگە جێ بە جێ ی بکەین: یەکەم: بەخەبەرهاتن ئازیزانم بیگومان

یەکەم جار بزانین هەموو مرۆڤێك نوستوە گەورەترین نیعمەتی خودا ئەوەیە کە کەسێك بەخەبەربێ بە خەبەر هاتنیش ئەوەیە کە نوورێکە خودای گەورە دەیخاتە ناو دڵی مرۆۆ ئەو مرۆڤە بەئاگا دێنێتەوە کە بەئاگا دێتەوە دەبینێ دووشتی زۆر گرنگی لەلا رۆیشتووە ئازیزانم وریای ئێرەبن سەیرکەن کاتێك ئەو مرۆڤە بەئاگا دێتەوە دەبینی ئەو چەند ساڵە نوستووە ئەبینی چەند عەیامە هیچ ئاگای لە خۆی نیە جا لێرە دووشتی زۆر گرنگی دێتەوە یاد کە لّی ی فەوتاوە: یەکەم دێتەوە یادی کە خودای گەورە نازو نیعمەتی زۆری پێ بەخشیوە خودای گەورە ئەو مرۆڤە نوقمی ناو ناز و نیعمەتی خۆی کردوە هەتاکو ئیستاش ئەو مرۆڤە بێ ئاگایە لە خودا و مافی ئەو هەموو ناز و نیعمەتەی نەداوە کە خودای گەورە پێ ی بەخشیوە دووەم دەبینی کەمتەرخەمی خۆێ ئیهمالی خۆێ کەمتەرخەمی و کەم کوڕی خۆێ دێتەوە یاد بەرامبەر خودای گەورە دەبینی زۆر کەمتەرخەمی بەرامبەر خودا زۆر گوێ ی نەدایتە فەرمانەکانی خودا ئەو هەموو ناز و نیعمەتەی پێ بەخشیوە تاکو ئێستا ئەو مرۆڤە هیچ هەستی پێ نەکردووە و هیمەتیشی نەکردووە کەوا بەرێك و پێکی بەخزمەت خودا بگات هیچ شتێکی وای نەکردوە کە ئەگەر لە قیامەتدا خودای گەورە حیسابی لەگەڵ بکا جانتای کردەوەی پڕ کردەوەی چاك لەگەڵ خۆی برد بێتەلای رب العالمین جا ئازیزانم کەس ناچێتە بەهەشت مەگەر پاك نەبێ دەی کەواتە هەر کەسێك پیس بێت دەبێ خۆی پاك بکاتەوە ئەو کەسەی کە دەیەوێ چاك بێ ئەو کەسەی دەیەوی بەرە و خودا بچێ دەبێ

بەخەبەربێ هەروەك ئیمامی(ابن القیم) لەکتێبی مدارج السالکین ئەفەرموێت یەکەم خاڵ باسی ئەوە دەکا دەفەرموی(منزلة الیقظة) بەخەبەرهاتن ئەو کەسەیە کە بەئاگا هات بیردەکاتەوە خودای گەورە زۆر ناز و نیعمەتی پێی بەخشیوە زۆر بێ وەفایە زۆر بێ ئەمەکیە زۆر بێ هوشی یە ئێمە تەنها ناز و نیعمەتی خودا بە خواردن و جل و بەرگ دابنێین نەخێر گەورەترین ناز و نیعمەت ئەوەیە کەتۆ کورنۆش بۆ کەس نابەی جگە لە خودای گەورە گەورەترین نازو نیعمەت ئەوەیە کە خودای گەورە ڕەمەزانی بەقسمەت کردی گەورەترین ناز و نیعمەت ئەوەیە تۆ ئیرادەت بە دەستە بەکەیفی خۆت ئەجولێتەوە وەکو ئاژەل نیت هیچ ئیرادەت بە دەست نەبێ و خەڵك پاڵت پێوەبنێن و بتهاژۆن و لێتبخورن جا بەڕاستی ئەو بەخەبەرهاتنە زۆر گرنگە مرۆڤ دەبێ بەخەبەربێ لەو هەموو ناز و نیعمەتەی کە خودای گەورە بە ئێمەی بەخشی یە ئەوەی دیارە و ئەوەی نادیارە هەر هەموو بیری لێ بکاتەوە و بیهێنێتە پێش چاوی خۆی ئەو کاتە بێ ئاگای خۆت بیردێتەوە بەرامبەر خودا ئەوکاتە بێ وەفایی و بێ ئەمەکی خۆی و کەمتەرخەمی خۆی دێتە پێش چاوی دەبینێ هیچی نەکردوە پیاوە چاکەکانی پێش ئێمە چییان کردوە بەرمبەر خودا چەند عیبادەت و خودا پەرستیان کردوە کەچی وەکو ئێمەش ئەو هەموو و نازو نیعمەتەیان نەدیوە نەنیعمەتەی کارەبا و سەیارە و ڕێگا و یان و کۆشك و تەلا ئەو هەموو خواردنەی کە ئێستا دەخورێ ئەو هەموو نیعمەتانەی کە ئێستا ژیانیان بۆ ئێمە ئاسان و خۆش کردوە کەچی ئەوانیش هەمووی بێ بەش بوینە لەو نازو نیعمەتانە

ئینجا سەد قاد و هەزار قاد زیاتر لە ئێمە شاد و شوکور بونەو عیبادەتی خودایان کردووە پیاوێکی وەکو ئیمامی ئەبوو حەنیفە دەفەرموێ چل ساڵ نوێژی بەیانی بەدەست نوێژی عیشا کردوە سبحانە الله هەتا ڕۆژێکیان یەك لە قوتابیەکانی دەڵی نوێژی عیشامان کر پاش نوێژی عیشا هەموویان ڕۆیشتن پاشان قوتابیەکە ووتی یا ئیمام تۆ دەمێنیتەوە ووتی بەڵی کەمێك دەمێنمەوە چراکە مەکوژێنەوە قوتابیەکە بەیانی هاتەوە مزگەوت ووتی ئەبینم ئیمام ئەبوو حەنیفە وا ڕیشی خۆی گرتوە داوای بەخشین لە خودای گەورە دەکات و ئەڵێ ئەی خودای گەورە کە نازو نیعمەتی زۆرت بەمن بەخشیوە من بەرامبەر تۆ زۆر بێ سیفەتم زۆر بێ ئەمەکم ئەوەند عیبادەتم نەکردوە ئەوەند خودا بەرسیتم نەکردوە کەببێتە مایەی ئەوەی لێم خۆش بی خودایە بەرەحمی خۆت ڕەحمم پێ بکەی و لێم خۆشبی ووتی کە هەستی بەمن کرد ووتی ئەوە ئیشت بەچراکەیە ووتم نەوە الله یائیمام بەیانیە هاتوومە بانگ بدەم لە عیشاوە تا بەیانی دانیشتوە و موناجات دەکا ئێمە دوو دەقە لە تەراویح مامۆستا تاخیربێ هاوارمان لێ هەڵدەسێ دەڵێن ئەو مەلایە زۆر تەراویحی درێژ کرد جا ئازێزانم ئەو بەخەبەر هاتنە زۆر گرنگە بۆ ئەوەی ئێمە بتوانین بەرامبەر خودای خۆمان لێی نزیك بینەوە چاك بین و رەفتاری لەگەڵ بکەین بۆیە ئەو مرۆڤە ئەگەر چاك و پاك نەبێ ناچێتە بەهەشت خودای گەورە خۆی پێمان دەفەرموێ﴿سَلَامٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَادْخُلُوهَا خَالِدِينَ﴾ الزمر: ٧٣ واتە فریشتەکان بە خەڵکی بەهەشت دەڵێن(سَلَامٌ عَلَيْكُمْ) سەلام لە ئێوە بێ(طِبْتُمْ) ئێوە

پاکن(فَادْخُلُوهَا) بڕۆنە ناو بەهەشت بۆیە تا ئێمە پاك نەبین کەس چاوی بە بەهەشت ناکەوێ جابەندە زۆر شت هەیە کە خوا پاکی بکاتەوە خودای گەورە ڕەحمی پێدەکات و پاکی دەکاتەوە ئەبینی ئەو مرۆڤە لۆ دونیا بە تۆبەو استغفار پاك ئەبێتەوە یاخود بە موسیبەت و غەموو پەژارە و خەفەت و نەخۆشی و ناخۆشی خودای گەورە پاکی دەکاتەوە ئەگەر بەوەش پاك نەبۆوە خودای گەورە لە ناو گۆڕ پاکی دەکاتەوە بە عەزابی گۆڕ یاخود ئەوانەی کە نوێژی مردوویان لەسەر دەکەن و ئەوانەی کە چاکەیان بۆ ئەنێرن یان دوعایان بۆ ئەکەن یان خێرو خێراتیان بۆ ڕەوان دەکەن ئەگەر هەربەو شێوەیەش پاك نەبۆوە خودای گەورە لە قیامەتدا پاکی دەکاتەوە بەترس و لەرزی و ناخۆشی قیامەت یا بە شەفاعەت و لێ خۆشبوون وە هەندێکیش ئەوا خودا ئەی سوتێنێ چونکە ئیلا ئەبێ بە پاکی بچێتە بەهەشت نابێ بە پیسی بچێتە بەهەشت ئەگەر بە بەرلێبوردنی خودا نەکەوت﴿سَلَامٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَادْخُلُوهَا خَالِدِينَ﴾ الزمر:٧٣ ئێوە ئێستا پاك بوون فەرموون بەو پاکییە بەرەو ناو بەهەشت بڕۆن جا ئەو مرۆڤە ئەو شێوەی بۆ دورست ئەبێ چی لێ دێ یەکەم شت کە لێپرسینەوەی لەگەڵ بکەیت و لێی ووریا بیت کاتەکانیەتی پێش هەموو شتێك ئاگای لە خۆی بێ لەکاتی خۆی بێ چونکە دەزانی عمرو کاتت سەرمایەی ژیانتە ئەو کاتانە ڕەصیدی تۆیە خودای گەورەیە بە تۆی داوە پێ ی ئەڵێ تۆ حەفتا ساڵ دەژی ئەو حەفتا ساڵە دەبێ زۆر ووریای خۆت بی چۆن ئەگەر کەسێك سەد هەزار لە بانك دابنێ هەموو مانگێ بچێ هەزار دیناری لێ سەحب کا

ئەبێن بەسەد مانگ کۆتای دێت خودای گەورە سەرمایەی تەمەنی تۆی ئەوەندە داناوە ئەبینیٚ چەند رۆژ و مانگ و چەند سالێکە ئەگەر زۆر زۆر وریای خۆت نەبی ئەو هەموو سالی تەمەنەت دەڕوا و بەبیٚ ی ئەوەی تۆ خەبەرت بیٚ بۆیە دەبیٚ زوو زوو بەخەبەر بیٚ ی بزانی ئەو تەمەنەت چەندی رۆیشتوە چەندی سەرفت کردووە بە بەلاش جا باقی تر ئاگات لیٚ ی بیٚ بۆ ئەوەی تۆ بەخەبەر بی ئەبیٚ بزانی ئەو تەمەنەت لە چی بەسەر بردوە بۆیە لە ئاینی ئیسلامی پیرۆز کاتێك ئەو مندالانەی کە عەقلیان کامل نەبووە وەلی هەلّدەستیٚ پارەکەیان ئەگێڕێتەوە نایداتە مندالّەکەی چونکە نازانیٚ چۆن سەرفی بکەن جا ئێمەش ئەبیٚ هۆشیار بین و بەئاگابین ئەگەرنا خودای گەورە ئەو نیعمەتەش لە ئێمە دەستێنێتەوە لەبەر ئەوەی ئەگەر کەسێك بەرەکەتی لەتەمەنی نەبوو بزانە بێبەشە بەڕاستی کات نیعمەتێکی خودایە کە ئێمە بتوانین ئەو کاتانە پڕ عیبادەت بکەین هەموو بەخوداپەرستی بەسەر ببەین خوداپەرستی هەر ئەوە نیە بەو واتایەی کە کەسێك بچێتە مزگەوت و نەیەتەدەر.

نەخێر گرنگ ئەوەیە تۆ لە خزمەت خودابی دەبیٚ لە خزمەت ئیسلام دابی بە هەموو شێوەیەك چ ئامۆژگاری خەلّك بکەی یا ڕێنیشاندەری خەلّك بی یا بەچاکی کرین و فرۆشتن بکەی یا ڕووخۆش بی لەگەلّ خەلّکدا یا یارمەتی خەلّك بدەی ئەوانە هەموویان لە عیبادەت و خودا پەرستی دەژمێردرێن گرنگە تۆ ئامادەبی هەر فەرمانێکی خودا هەبیٚ زۆر زۆر بەڕێك و پێکی ئەنجامی بدەی جا لەوەهەلّ و مەرجەدا.

دووەم ((گۆڕان))

بواری دووەم دەرەخسێ پاش هەستان و بەخەبەر هاتن ئەوەیە دەبێ لێرەدا مرۆڤ بگۆڕی تاکو مرۆڤ بەبیر نەگۆڕی هەرگیز دڵی کەڵك وەرناگرێ دەبێ بە یەقینەوە بگۆڕێ دەبێ بیری بگۆڕی ئینجا ئەو بیرە کاریگەری لە باقی جەستەی دەکات نمونە دەبینی من کەسێك ئەبینم زۆر ڕێزی ئەگرم لەبەرچی چونکە قەناعەتم هەیە کە شانیەتی ڕێزی بگرم کەسێکی تر ئەبینم بێ بروایە بێ دینە ڕێزی ناگرم بۆ ڕێزی ناگرم لەبەرچی چونکە قەناعەتی بیرم هەیە وام لێ دەکا کە ڕێزی نەگرم دەی کەواتە هەڵوێستی تۆ بەرامبەر خودای گەورە چۆنە ئێمە لە کاتی عیبادەت و خودا پەرستیمان و نزیك بوونەوەمان لە خودای گەورە دەبێ لەبیردا دەست پێ بکا چونکە هەر کاتێك مرۆڤ بەبیر قەناعەتی هات کە خودای گەورە نازو نیعمەتی زۆری پێ بەخشیوە و وەکەمتەرمیشە بەرامبەر خوداو وە هەموو کاتەکانیشی بەفیڕۆ چووە ئالەو کاتەدا مرۆڤ قەناعەتی دێ کە بجولێتەوەو هەوڵبداو هیمەت بکا چۆناو چۆن بەرەو خودا بچێ.

سێیەم((عزم جزم))

ئینجا دێتە سەر قۆناغی سێیەم کە عزم و جزم بکا ئەوجارە کە هەڵساوە کە نوستبوو بە ئاگا هات بیری کردەوە زۆر زەرەری کردوە لە تەمەنی هەڵدەستێ و ئەیەوێ دەست بە کار بێ ئەلێرە عزم و جزم دورست دەبێ ئەو مرۆڤە هەڵدەستێت و چی دەکا(فإذا عزمت فتوکل علی الله) لێرە

مەبەستێك و نیشانەیەك لە ناو دڵی هەیە واز لەو لاساریە بێنێ واز لەو بێ ئاگاییە بێنێ واز لەو هەموو تاوانانە بێنێ تا ئێستا لە ناوی نوقوم بوە و پیس بووە پێیانەوە بەڵام ئەیەوێ بگاتە پاکی و بەرەو خودا بچێ دەکا عزم و جزم دورست دەکا یانی لە دڵدا بڕیار دەدەیت ئیتر ئەم شێوە ژیانەت بگۆڕیت هەرچی کاری خراپە هەیە لێ ی دوورکەویتەوە وە دەست بەکاری چاك بکەیت وە هەموو جولانەوەیەکت لەمەودوا ئەبێ بەپێی شەرع بێت ئینجا کە ئەم حاڵەتەت.

چوارەم: لێ پرسینەوە

دورست کرد دەبێ دەست بە لێپرسینەوە بکا چونکە لێپرسینەوەی دەروون پێش تۆبە کردنە دەبێ لێرەدا دەست بە لێپرسینەوە بکات پێش تۆبەو دوای تۆبەش. پێش تۆبە ئەوەیە تۆ بزانی کە خودای گەورە ئەو هەموو بەهەشت و جەهەنەم و عەزاب و ئەشکەنجە و ئازارو ئەو هەموو نازو نیعمەتەی داناوە تۆ هەتاکو ئێستا خۆت لێك نەداوەتەوە لە کامەیانی تاکو ئێستا خودای خۆت نەناسیوە﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ﴾ الزمر:٦٧ تاکو ئێستا مرۆڤەکان حەقی ڕێزو گەورەیی خودایان نەداوە ئازیزانم واللەهی ئێمە دەبێ بزانین کە خودا خودایە و بەندەش بەندەیە بۆیە تاکو مرۆڤ گەورەیی و هەیبەت و دەسەڵاتی خودای گەورە نەناسێ هەرگیزاو هەرگیز لێ ی ناترسێ تاکو ئێستا بە ڕاستی لەو خودایە نەترساوین لەگەڵ ئەمەش خودای گەورە بەنەفرەتی خۆی ڕەفتاری لەگەڵ نەکردووین خودای گەورە

بۆ خۆی ئەفەرموێ لە حەدیسی قودسی رەحمەتم پێش عەزابم خستوە بۆیە ئێمە ئاوا بێ ئاگاین لەوەی ئەگەر بێتوو خودای گەورە بەکەرەمی خۆی نەبوایە بەعەزاب مامەڵەی لەگەڵ کردباین ئێستا ئێمە زۆربەی زۆرمان بە هیلاك چوبووین بەڵام بەخشش و بەزەیی خودا زاڵە بەسەر غەزەبەکەی بۆیە مرۆڤ دەبێ هەرگیزاو هەرگیز دڵنیا نەبێ لە تورەبوونی خودا بە خۆی بێئاگایمان لە زاتی خودا هەرگیزاو هەرگیز بێ ئاگا نەبێ لە خودای گەورە کە لە ناکاو لێمان تورەبێ.

نمونە: ئەو بومەلەرزەی وڵاتی تورکیا گەورەترین بەڵگەیە لەسەر نەفرەتی خودا ئەگەر خودا نەفرەتی کردەسەرمان کەس نی یە بتوانی بەرامبەری بوەستێ بەڵام بیستتان هۆی ڕاستی ئەو بومەلەرزە ئەوەیە یەك لە کەشتیە جەنگیەکان کە لەوێ کەشتی جەنگی ئەمریکی هەن فرۆکەی لەسەر ئەنیشێ کەشتی زۆر گەورەنە ئەو کەشتیانە جێگای چەندەها فرۆکە ئەگرێ کە لە دەریا گەورەکان رادەوستن لەسەر ئەو کەشتیەی ئەوانە ئاهەنگێکیان کردوە سێ هەزار کەس بوونە هەندێکیان ئەفسەری جولەکەی بوینە هەندێکی تریش ئەفسەری ئەمریکی بووینە وە هەندێك لە جەنەڕاڵەکان زۆربەیان جەنەڕاڵی تورکیا بووینە ئەوانە لەوێ دانیشتونە سەماو بیشەرعیان کردوە چەند ئافرەتی داوین پیسی تورکی و ئەمریکی و جولەکە هەبوو لەسەر ئەو کەشتیە هەڵپەرینەو بێشەرعیان کردوە لەو کاتەدا جەنەڕالێکی تورکی بە ئەفسەرێکی دەڵێ برۆ قورئانەکم بۆ بێنە ئەفسەرەکەش لەبەر ئەوەی جەنەڕاڵ پلەی لەو بەرزترە ناچار دەچێ

قورئانەکی بۆ دێنیٚ دەڵیٚ بۆم بخوێنەوە ئەویش هەندێکی بۆ دەخوێنێتەوە دەڵیٚ واتاکەی بۆم لێدەوە دەڵیٚ نازانم دەبیٚ بمبوری جا قورئانەکەی لێوەردەگریٚ پارچە پارچەی دەکاو لەژێر پێی ئافرەتە سەماکەرەکان فرێدەدا جائەوە زۆر ترسناکە ئینجا دەست بلَند دەکاو دەڵیٚ کا ئەو خودایە کە ئەڵیٚ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ الحجر:٩ بابیٚ ئەو قورئانە لە ژێر پێی ئەو ئافرەتانە دەربێنیٚ بابیٚ بیپارێزیٚ چۆن قورئانەکەی خۆی دەپارێزیٚ با دفاع لە قورئانەکەی بکا نەفرەتی خودا لێرە هەڵسا ئەوەبوو ئەفسەرەکە ئەڵیٚ من زۆر ترسام ڕام کرد زانیم ئەمە شتێکی ئاسایی نیە شتێکی زۆر گەورەی کردوە ئەڵیٚ ئیمە کەبیٚ شەرعیمان دەکرد بیٚ ئەقل بووین بەڵام ئەو ئیهانە کردنەی قورئانی پیرۆز هەرگیزا و هەرگیز خودا لیٚ ی بیٚ دەنگ نابیٚ ووتی هەلسام هاتمە دەریٚ و پەریمەوە لە پاپۆرێك ئەڵی گەیشتمە لێواری دەریاکە کە ئاورم داوە دیتم دەریاکە کەرت بوو ئەوە بە چاوی خۆیان بینییان بەڵام هۆیەکانی ڕاگەندن ئەم راستیەیان شاردۆتەوە و کپیان کردوە جا ئەڵی کە دەریاکە شەق بوو ئەو کەشتیەکە سیٚ هەزار کەسی تێدا بوو نقووم بووە ناو دەریاکە ئێستا یەك کەس نازانی چیان لیٚ بەسەر هاتییە لە ئیسرائیل تاقمێك لە خبراء هاتن گەڕان یەك پارچەشیان نەدۆزییەوە ئەوە بوو خودای گەورە نقوومی کردن جا ئەڵی کەشتیەکە نقووم بوو پارچە ئاگرێك پەیدا بوو ئینجا شاری ئەزمەر دەستی بەبومەلەرزە کرد و زەوی لەرزی هەتا هەندێك لە شارەکەشی کاول کرد تەنها یەك مزگەوت ماوە نەروخا ئەوە نەفرەتی

خودایە ئەمە تورە بوونی خودایە بزانن ئەمە کەمێکە لە تورە بوونی خودا ئازیزانم ئێمە دەبێ خودا بناسین بزانین خودای گەورە غفور و رەحیمە ئەگەر خودا غەزەبی هەڵسێ بە کەس ناوەستێ هیچ هێزێك هیچ دەسەلاتێك ناتوانێت بەرامبەری بوەستێ یان خۆی بەرامبەری بگرێ جا ئازیزانم ئێمە دەبێ لەو کاتەوا بەئاگابین و بەئاگابێینەوە وەبزانین کە نەفرەتی خودا هەڵسا کەس نیە بەرامبەری بوەستی بۆیە دەبێ ئێمە تەدارەکی حاڵی خۆمان بکەین پێش ئەوەی خودای گەورە عەزەبی خۆی لێمان بگرێ ئازیزانم لێرە لێبرسینەوە دەست پێدەکا جا مرۆڤ دەبێ خۆی بناسێ و خودای گەورەش بناسێ کە خۆی ناسی مرۆڤێکی زەلیلە هیچ نی یە بەرامبەر خودایەکی عظیم و قادر ئەلێرە وا چ دەکا هەوڵ دەدا لێ ی نزیك ببێتەوە ئینجا هەوڵ دەدا صولحی لەگەڵ بکا و پێ ی ئاشنابێ جا چەند مەبەستێك هەیە کە لە دەروونی ئێمە دروست دەبێ یەکەم: دەبێ هەمووکات تۆ گومانی باش بەدەروونی خۆت نەبەی هەر کەسێك گومانی باش بەدەرونی خۆی ببا ئەوشتە رێگر دەبێ لەوەی کە کاری جوان بکا چونکە ئەگەر کەسەکە خراپەشی کرد هەر گومانی باش دێتە بەر چاوی هەرگیزاو هەرگیز دڵنیا نەبن لە دەرونی خۆتان چونکە زۆرشت هەیە نیقمەتە ئێمە بە نیعمەتی تێدەگەین نموونە: ئەگەر پیاوێك خودای گەورە ماڵی پێدا ئەو ماڵەی لە پێناوی خودا سەرف نەکرد ئەوە نیقمەتە با بۆ خۆی بە نیعمەتی لێك بداتەوە نەفست بە نیعمەت لێك ئەداتەوە بۆ ئەوەی بێ ئاگات بکا لە خودا بەڵام دەبێ بزانی ئەوە نیقمەتە ئاگات لێبێ بۆیە

دەبێ وریا بی ئەگەر خەڵك پێیان هەڵدەگوتی مەدحیان ئەكردی بە چاكەی زۆر واش نەبوو بەڵام بەخۆشت وانەبووی كەچی ئەوانیش هەر پێیاندا هەڵدەگوتی بزانە نیقمەتە نەك نیعمەت وانەزانی خودا ڕێزی تۆی گرتوە بەڵكو ئەوە ئیستدراجە بزانە خودای گەورە لێتی سەندەوە وە زەلیل و زەبونی كردی لە ناو خەڵكی دەبێ زۆر وریا بی لە ژوورەوە چۆنی لە دەرەوەش ئاوابی خەڵك ڕێزی گرتی دەستی لەسەر سینگی دانای بڕۆ تۆ لە ماڵەوە زۆر بپارێوە لەبەر خودا خۆت بشكێنەوە نەوەك خودای گەورە كەشفت بكا و ڕاستی بۆ خەڵك ئاشكرا بكاو لە دەرێ خەڵك بە چاوی كەم تەماشات بكەن و تفو لەعنەتت بكەن جا لێرە ئەو نەفسە نابێ گومانی باشی پێببەی هەمووكات دەبێ سەركۆنەی بكەی هەمووكات بیشكێنیەوە بۆیە تەماشاكە لە قورئان هەموو عیبادەتەكان كاتێك عیبادەتەكە تەواو دەكرێ پاشان استغفاری تێدایە كاتێك خودای گەورە باسی حەج دەكا ئەفەرموێ﴿ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ وَاسْتَغْفِرُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ البقرە:١٩٩ واتە لە عرەفە كە شوێنێكی پیرۆزە كە خەڵك لەوێ دەبنە حاجی كە چوونە عەرەفەو هاتنەوە ئینجا لەو كات بڕۆن طوافی افاضة ئەنجام بدەن و خوا غەفوور و رەحیمە تۆبە بكەن لەبەر چی چونكە هەر كاتێك كە تۆ پێی معجب بی كەیفت پێ بێ خودای گەورە قەبولی ناكا بۆیە پیاوە صالحەكان دەیان فەرموو ئەگەر كەسێك شەو نوێژی بچێ بەیانی پەشمان بێتەوە زۆر خەفەت بار بێ بەمە لە نەفسی خۆی كە شەونوێژی چووە جا ئەو كەسە خێری زۆر گەورەترە لە كەسێك شەو نوێژ

بکاو پێی سەرسام بێ کەسێك ئەگەر شتێك بکاو پێی موتەئەسیر بێ زۆر زۆر بەرامبەر خودا زەلیلی دێتە پێش چاو ئەوە زۆر گەورەترە لە کەسێك کە ئیشێك بکا پێی سەرسام بێ یان کەیفی بەخۆ بێت و عجب بیگرێت جا مرۆڤ بۆیە هەموو کردەوەیەك کە دەیکا دەبێ تۆبەی لە دوا بکا خودای گەورە باسی رۆژی فتحی دەکات ئەفەرموێت﴿إِذَا جَاء نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ﴾ النصر:١﴿وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا﴾النصر:٢ .

سەیرکە ئەوە گەورەترین نیعمەتە کە خودا دایتیە محمد المصطفی﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا﴾ النصر:٣ بەو فتحە زۆر تۆبە بکەن شوکرانەی خوای لەسەر بکەن پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە نوێژی دەکرد لە پاش هەموو نوێژێ سێ جار دەیفەرموو استغفرالله جا ئێمە دەبێ کە نوێژمان کرد پێویستی بە استغفرالله نەوەك شەیتان زەفەرت پێبباو بڵێ بە خودا نوێژێکی جوانت کرد ئەو نوێژە خودا پێی خۆشە مغرور بیت بە نوێژەکە نەخێر نابێ مرۆڤ بە هیچ جۆریك گومانی باش بە دەرونی خۆی ببا دەبێ هەمووکات گومانی خراپ لە دەروونی خۆی بکا واللەهی کردەوەکانم زۆربەی دونیاییە خودا هیچی لێ قەبول نەکردیمە من چۆن ئەتوانم حەقی تەواوی خودا بدەم بەم کردەوانە کە زۆر بچووك و کەمن بەرامبەر نازو نیعمەتە زۆرەکانی خوا من چۆن بتوانم بەم مفلیسیە رووبەرووی خودای گەورە ببمەوە ئەگەر خودای گەورە لێی قەبول کردباما ئێستا من لە نازوو نیعمەت دەژیام گەر قەبولیش نەکا هاوار لەبۆ خۆم خوایە لێم خۆش ببە جا ئەو شەرکردنە لەگەڵ دەروونی خۆتدا وەت

لێدەکات کە بەڕاستی خۆت ئامادەبکەی بۆ قیامەت چونکە خودای گەورە دەفەرمووێ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ الحشر:١٨

واتە ئەو کەسانەی ئیمانتان هەیە لە خودا بترسن پاشان(وَلْتَنظُرْ) تەماشا کەن چیتان ڕەوانە کردووە بۆ بەیانی مانای وایە تۆ وا بزانی بەیانی قیامەتە بەم شێوەیە سەرزەنشتی خۆت بکەی هەروەك ئیمامی عومەر دەفەرمویێ(حاسبوا انفسکم قبل ان تحاسبوا وزنوا اعمالکم قبل توزنوا واستعدوا للعرض الاکبر) واتە مرۆڤ دەبێ بە ڕاستی خۆی ئامادە بکا بۆ ڕۆژی قیامەت ئەبێت محاسەبەی خۆت بکەی پێش ئەوەی حیسابت لەگەڵ بکەن وە کردەوەکانی خۆت بکێشیت پێش ئەوەی کردەوەکانت بکێشن کە لە بەرامبەر خودا ڕائەوەستی ئەی موسڵمانان تاوەکو موحاسبەی خۆت نەکا بە سیرەو ئەقل و بیری بەخەبەر نەبێ هەرگیزاو هەرگیز بە چاکی بەرەو خودا ناچی بۆیە کاتێك هاوەڵێك هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بە هاوەڵەکەی حاڵت چۆنە ووتی زۆر باشم فەرمووی ئیمانت چۆنە فەرموی الحمدالله ئیمانم زۆر تەواوە فەرموی هەموو شتێك دەلیلی هەیە دەلیلی ئیمانی تۆ چیە هاوەڵەکە فەرموی یارسول الله واللەهی خەڵکی بەهەشت دەبینم وا لەناو بەهەشتن خەڵکی دۆزەخ دەبینم وا لەناو دۆزەخن لەو دوو ساتەدا ئەگەر خۆم بە خەڵکی بەهەشت حیساب کەم ئەوە لەپەری نازو نیعمەتم ئەگەر خەڵکی دۆزەخ بم ئەوە زۆر لە ئەشکەنجەو ئازاردام ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئێستا ئیمانت تەواوە

ئاگات لیٚ ی بیٚت ئازیزانم بەڕاستی بۆ ئەوەی ئێمە دروست بین ئاوا دروست بین بەڕاستی بزانین خودای گەورە ئێمە زیندو ئەکاتەوە حەشر و حیسابمان لەگەڵ دەکا نەوەك وەکو چیرۆکێکی ئەفسانە یاخود وەعزێکی مامۆستا تەنها پیٚ ی کاریگەر بین نەخیر دەبیٚ یەقینت بیٚ قەناعەتت بیٚ سەد لە سەد کەوابە چاوی خۆت ئەبینی کە رۆژی قیامەتە کاتێك کە گوێت لە قورئان ئەبیٚ یاخود ئەیخوێنی کە باسی قیامەت دەکا ئەوکات وابزانی تۆ بەشێکی لەو پیشاندراوە وابزانی ئێستا خەڵك زیندوو بونەوە و ئەوە حەشر و حیسابت لەگەڵ دەکریٚ ئەوە نامەی کردەوەکانت دابەش کرا ئەوە پردی صیراتە ئەوە بەهەشتە ئەوە ئەشکەنجەی جەهەنەمە لەو کاتەدا کە تۆ لە ناو ئەو ڕاستیە بووی ئینجا دروست ئەبی ئینجا هەڵەستیە سەرپیٚ ی بۆ ئەوەی تۆبەبکەی و صولح لەگەڵ خودا بکەی بۆ ئەوەی صالح و چاك بی جا ئەو قۆناغەمان بڕی قوناغی تر انشاء الله لە ووتارەکانی دی تەواوی دەکەم واخر دعوانا ان الحمد الله رب لعالمین والسلام علیکم ورحمة اللة وبراکاتە.

# ٤- تەوبەكردن

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**الحمد الله رب العالمين والصلاة والسلام على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه اجمعين السلام عليكم ورحمة الله وبركاته.**

خوشەویستانم ئێمە لە بابەتی ڕابردوو باسی ئەوەمان كرد كە ئێمەی موسڵمان نووستوین زۆر پێویستی بەوە هەیە كە بەخەبەر بێین سەیرێكی دەورووبەری خۆمان بكەین و بزانین تاچ ئاستێك حەقی خودای گەورەمان داوە وەتاچ ڕادەیەك ئەو ئەرك و ئەو شتانەی كە لەسەر شانمان ئەركە ئەوەمان كردوە بەڕیك و پێكی و وەتاچ ڕادەیەك دوژمنكاری لەگەڵ شەیتانی نەفرەتیمان كردووە كە خودای گەورە ئەمر بەئێمە دەكا و دەفەرموێت﴿الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا﴾ فاطر:٦ واتە شەیتان دوژمنی ئێوەیە و ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی بزانن و مامەلەی لەگەڵ بكەن تاكو بزانین تاچ ئاستێك ئێمە لە خودا نزیكین بۆ ئەوەی لە حاڵ و حیسابی خۆمان بگەین جا ووتمان :

(یەكەمین) شت ئەوەیە كە بە خەبەر بێن بەخەبەر هاتن مەرجە بۆ ئەو كەسەی ئەیەوی بەرەو خودای رب العالمین بچی تاكو تۆ نوستبی بێ ئاگابی ئەوە هیچ سوودێك و گرنگیەكت نیە نەبۆ دونیا وە نەدەتوانی بۆ

دوایش دەتوانی شتێك پەیدا بكەی جا مەرجی یەكەم ئەوەبو كە ووتمان دەبێ بەخەبەر بێین وەچەند شتێكمان باس كرد (دووەم) شت ووتمان دەبێ قوناغی دووەم كە ئەو مرۆڤە پێدا دەڕوا ئەو كەسەی دەیەوێ بەرەو خودای گەورە بچێ چاك بێ تاكو خودای گەورە ڕەفتاری چاكانی لەگەڵ بكا ئەویش ئەوەیە دەبێ ئەقل و بیر و هۆشی خۆی بخاتە كار ئالێرە بیر لەحاڵ و حیسابی خۆی بكاتەوە.

(سێیەمین شت) عزم و جزم پەیدا بكا وەهەروەها بەڵێن بدات كە بەرەو خودا بچێت هەڵسێتە سەرپێ ئیتر بەرگەی ئەو بارەی ناگرێت كە تێدایەو بەرگەی ئەو هەموو گوناهەی نەگرێت كە لەسەر شانیەتی پێویستەو دەبێ بەرەو خودا بچێ وەدەبێ بەرەو كاروانی چاكان بەڕێ بكەوێ وە شەیتانی تاوانبار و خودا نەناس قێزی لێ بكات وە هەروەها شەرمەزاری بكاو وازی لێ بێنی و لە كۆت و زنجیری شەیتان ڕزگاری بی بەرەو رب العالمین بكەوێتە رێ.

چوارمین شت كە پیویستە و گرنگە بۆ مرۆڤێ كەبەرەو خودا بچێ ئەویش ئەوەیە كە بەخۆدا چوونەوەی خۆی دەست پێ بكاتن وە وتیشمان دەبێ ئەو مرۆڤە پێدا چوونەوەیەكی زۆر بەوردی دەرونی خۆی بكا وەنابێ هیچ كات لە دەرونی خۆی دڵنیابێ جا لەبەر ئەوە ئازیزانم ئەگەر ئێمە بەوردی سەیری خۆمان بكەین واللە شتێكی وامان نیە كە ئێمە بەو شتە بچینە قیامەتێ خۆمان لە ئاگری دۆزەخ دووربخەینەوە یاخوود بەو شتە وا بكەین كە خودای گەورە بمان بەخشێ ئەگەر هەڵدەخەڵەتێن بەوەی كە

ئێمە موسڵمانین و قورئان دەخوێنین کە مانگی رەمەزان دێ خەتم دەکەین واللە ئەگەر وورد بینەوە ئەوە قورئان خوێندن نیە کە خودای گەورە فرمانی بە ئێمە کردوە کە ئاو بیخوێنین ئەو قورئان خوێندنە نیە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاوەڵەکانی فێرکرد ئێمە هەر دەخوێنین و لاپەرەی ئاوا دەکەین و بەس بەڵکو لەگەڵ مانگی ڕەمەزان سی ی جزئەکەی تەواو بکەین یاخود خەتمی بکەین تەنها بۆ خەتم کردن نیە و بەس بەڵکو مەبەستی سەرەکی ئەیەوێ موسڵمانان لێ ی تێبگەن کە ئەم قورئانە قورئانێکە تێکەڵ بی لەگەڵ بیرو هۆش و دڵ و دەروون.

قورئانێك بێ کە تۆ بەسەر هەر خەتێکی ئایەتێك ئەمری تێدا بێ هەڵسیتە سەر پێ ئەمرەکەی جێ بە جێ بکەی قورئان خوێندنێك بێ کاتێك گەیشتیە نەهیەك یەکسەر نەهیەکە نەکەی هەر کاتێك گەیشتیە ئایەتی مژدە دەر بزانی ئەو شتە چیە کە ئەو کەسە مژدەی پێدراوە دەست بەجێ جی بە جێ ی بکەی یاخود گەیشتیە ترس و تۆڵە و سزاو عەزابی خودای گەورە یەکسەر تۆبە بکەی و بگەرێتەوە و بگری جا ئەگەر بێتو بەو هۆش و بیرە قورئان بخوێنی تا ڕەمەزان دەڕوا یەك جزء ناخوێنی دەی کەواتە ئەگەر بێتوو هەر چەندە کردەوەت و قورئان خوێندنت زۆر بێ کاتێك بیری لێ دەکەیتەوە ئەو قورئان خوێندنەی کە خوداو پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێن ئێمە قورئان خوێنە نین وە ئێمە ئەو عابدو خودا پەرستە نین کە مامەڵە لەگەڵ قورئان بکەین وەیان بە نوێژەکانمان هەڵ دەخەڵەتێین دەڵێن لە مانگی ڕەمەزان زۆر تاعەتو عیبادەت دەکەین واللە

ئەو نوێژە نیە کە خودا و پێغەمبەری خودای گەورە مەبەستییانە بۆی (ابن عباس) ئەیفەرموو شەو دوو رکات نوێژ بکەم بە فکرو بە ئاگا لە خۆبوون و ئاگام لە نوێژەکەم بێ زۆر زۆر پێم خۆشترە لەوەی کە سەد رکات بکەم ئاگام لە نوێژەکەم نەبێ کامەمان لەوەتەی ڕەمەزانە دوو رکات نوێژمان کردوە خەیاڵمان لە ناو نوێژەکەمان نەچووبێتەدەرێ خودا ئەو نوێژەی مەبەستە نەوەك تۆ هەر سوجدەو ڕکوع ببەیتوو دوو رکات دوورکاتان بەرێکی بکەی نەخێر بەڵکو نوێژێك لە رۆژی قیامەت بە کەڵکت دێتوو ڕزگارت دەکا کە تۆ هەموو هەست و هۆش و هەموو ئاگاداریەکت لەناو نوێژەکەت دابێ جا(ابن القیم الجوزی) ڕەزای خودای لەسەر بێ کە کتێبێکی هەیە باسی ئەوە دەکا کە پیاوە چاکەکان کە تیایدا چۆن نوێژیان دەکرد دەفەرمووێ ئێمەی موسڵمان کە نوێژ دەکەین وەك کەسێك واین بچینە کۆشکێك جا لە ناو ئەو کۆشکە دەبینە دووبەش هەندێکمان بەس خەریکی نەخش و نیگاری ناو کۆشکەکەبین تەماشای سوڕەیا و دیمەنەکەی ناوی دەکەین ئاگامان لەوەنیە کە لە ناو کۆشکەکەیدا پاشایەك هەیە و ئێستا پاشایەکە دێت لەگەڵت دائەنیشێ قسەی لەگەڵ دەکەی گفتوگۆی لەگەڵ دەکەی تام و لەزەتی قسەکردنی پاشایەکە زۆر زۆر خۆشترو بەتامترە لەو دیمەنەی کە دەیبینی لەناو کۆشکەکەدا بەڵام بەشی دووەم ئەوەیە گوێ ناداتە ناو کۆشکەکەی کەچی تیایەو چی تیانیە بەڵکو ڕاناوەستێ و ئاوڕناداتەوە تا دەگاتە پاشا ئینجا پاشا هەندێك خواردنی خۆش و بەتامی لەپێش دادەنێ ئینجا ئەو کەسە تام لەزەت لە هاتنی بۆ

ناو کۆشکەکە دەکا جا ئازیزانم بەڕاستی ئێمەش واین کاتێك کە نوێژ تەنها پیتان دەخوێنین تەنها سورەتی فاتیحە چەند پیتێکە ولە زارمان دێتە دەرەوە هەر چەند تەسبحات و سبحان رب الاعلى لەزارما دێتە دەرەوە جووڵە یەکی کورنوش و رکوع دەیکەین وتەواو بەلام کەسانێك هەن وەکو ئێمە نین کاتێك کە دووڕکات نوێژ دەکەن ئەوان تام چێژ لەنوێژەکە دەکەن بۆیە (ابراهیمی کوری ئەدهەم) هەزار رەحمەتی خودای لێبێ ئەیفەرموو ئەو تام لەزەت و خۆشیەی من لەشەو نوێژدا دەکەم ئەگەر کورە پاشاکان بیان زانیبا چەند خۆشە ئەوە دەهاتن بەشمشێر لێیان دەسەندم چونکە ئاسایی کوڕە پاشا کامە خۆشی و لەزەتە بۆ خۆیان دەوێ بۆ خەڵکیان ناوێ جا بەڕاستی ئەمانە تامیان لە نوێژ کردوە کەسێکی وەکو(ئیمامی ابو حنیفه) یان چەندانێکی تر پێم سەیر بوو ئەیان ووت بەیەك شەو دوو ڕکات نوێژیان دەکرد لە نوێژی عیشا تاکو نوێژی بەیانی دوو ڕکات بێ زۆرم پێ سەیر بوو بەڕاستی تێنەگەیشتم بەلام ئێستا تێدەگەم.

کاتێك ئەو نامیلکەی(ابن القیم) خوێندەوە کەبێ گومان کابرا لە ناز و نیعمەت و خۆشیەکی وادا ژیاوە ئەگەر دوو ڕۆژان لە ناو نوێژەکەی بوایە لاقی نەدەجولاند جا ئازیزانم ئەگەر ئێمە ئاوا بە ووردی سەرکۆنەی دەروونی خۆمان بکەین والله زادو زەخیرەیەکی وامان نیە کە بچینەوە خزمەت ئەو خودایە گەورەیە جا پێویستە ئێمە پێش ئەوەی بچینە خزمەت ئەو خودایە ڕێکەوتنی لەگەڵ بکەین دەبێ ئێمە باری خۆمان سوك بکەین لەو چڵك و پیساتیەی ئێمەی پیس کردوە ئەو ژەنگەی کە لە دڵی وەرداوین هەر

مرۆڤێك ئەگەر بیەوێ بچێتە ناو نوێژ پێش نوێژەكەی چەند مەرجێكی لەسەر واجبە ئەگەر جەنابەتی هەبێ دەبێ خۆی بشوا ئەگەر دەست نوێژی نەبوو دەبێ دەست نوێژ بشوا ئینجا دەتوانی بچیتە ناو نوێژ قسە لەگەڵ رب العالمین بكا ئەی موسڵمانان ئەوەی دەیەوێ لە خودا نزیك بێتەوە پێویستە یەكەم جار خۆی بشوا بە ئاوی تەوبە ئینجا بەسەر كۆنەی خۆی و بە ئەو وێردانەی كەوا پاكی دەكاتەوە دڵ و دەروونی سوك دەكات و نزیكی دەكاتەوە لە خودا پاشان دەست نوێژی بشوا ئینجا بەو مەقامەتە دەگا كە بتوانێ قسە لەگەڵ خودا بكا تام و چێژی موناجات لەگەڵ خودای گەورە وەربگرێ جا ئازیزانم هەرچەندە مرۆڤ لە موحاسەبەدا توندو بەهێز بێت ئەوەندە زیاتر و زووتر بە خزمەت خودای گەورە دەگا ئەوندە زیاتر دەست بەندی نەفس و شەیتان ئازاد ئەبی چونكە ئێمە ئێستا دەست بەند و پێبەند كراوین بە تاوان و ئارەزوەكانمانەوە بەو شتانەی كە شەیتان پێی خۆشە و كەیفی پێ دێ ئێمە جێ بەجێ ی دەكەین ئەوە دەبێتە مایەی ئەوەی كەهەموو لەشمان زنجیر بەند بكرێ یەك لە پیاو چاكان ئەیفەرموو چێم سەیرە چۆن كەسێك نوری ئیمان و نوری موناجات خودا لەدڵی رۆشەن ئەوا ئەوە كاتێك ئەو دڵە پیش بوبێ بەشەهەوات چۆن مرۆڤێك هەنگاو دەنێ بەرەوخودا بچێ بەرەو موناجات خودا بچێ و تام لە موناجات بكا كاتێك كە پێیەكانی هەردووك پێ بەند كرابێ بەبێ بەندی شەیتان جا ئازیزانم بەڕاستی ئێمە پێویستمان بەوەیە كە خومان ئازادبكەین باشترین شتیش كە ئێمە خۆمان پێ ئازاد بكەین ئەوەیە ئێمە خودای خۆمان

بناسین هەروەك خودای گەورە دەفەرموێ ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ﴾ الزمر ٦٧ .

هەتاکو ئێستا خەڵك قەدرو قیمەت و عەزەمەتی خودای گەورەی نەناسیوە والله ئەگەر مرۆڤ خودای گەورە بناسێ والله ناوێری تاوان بکا ناوێری مەعسیەت بکا بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك کە حەزرەتی جبرائیل لە مەقامی ئیحسان بێ ی پرسی فەرموی (أن تعبد الله كانك تراه فان لم تكن تراه فانه يراك) واتە دەبێ خودای گەورە بپەرستین هەروەکو ئەیبینین ئەگەر ئێمەش نەیبینین ئەو ئێمە دەبینێ بێ گومان مەقامی ئیحسان کە کۆتایی پلەیە مرۆڤ بیگاتێ لەو کاتەی ئەبێ ئەو پیاوە لە دڵی خۆی وەك بڵێ ی خودا دەبینێ هەر کەسێکیش خودای ئاوا لە دڵراناسی ئەوە زۆر پیاوێکی چاکی لێ دەرئەچێ ئەو پیاوە هی ئەوەیە ئەمین بێ لە خۆی لە رۆژی دوایی خودای گەورە ئازارو ئەشکەنجەی نادات جابۆیە سەیرکەن لە قورئاندا خودای گەورە هەندێك جار هەرەشەمان لێ دەکاو دەفەرموێ﴿أَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاء أَن يَخْسِفَ بِكُمُ الأَرْضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ﴾ الملك:١٦ واتە ئەڵێ ئەی خەڵکینە ئێوە بەچ لە خۆتان ئەمین دەبن بەو کردەوەی تازە ووتم کە هەموی جاران سفری دەکەی بەو کردەوانەی کە نیوەی هەر ریایە و حەزمان لێیە خەڵك بزانن و پێماندا هەڵبڵێن و باسمان بکەن بەمانە لە خۆتان ئەمین دەبن نا بەخودا وای لە حاڵتان بۆیە خودای گەورە دەفەرموێ﴿أَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاء.....﴾ئایە ئێوە لە خۆتان ئەمینن ئەگەر خەڵکی ئاسمان کە رب العالمین کە زەویتان لە ژێر پێی

نەجولێنىٚ نەتان فەوتێنىٚ﴿أَمْ أَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاء أَن يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا فَسَتَعْلَمُونَ كَيْفَ نَذِيرِ﴾ الملك:١٧

واتە ئایە لە خۆتان ئەمینن ئەگەر خودای گەورە لە ئاسمان ڕەشەكە بایەكى واتان بۆ هەڵكات كە هەمووتان بفەوتێنىٚ بەو بایە﴿فَسَتَعْلَمُونَ كَيْفَ نَذِيرِ﴾ الملك:١٧ ئەو كات دەزانن سزاى خوداى گەورە چۆنە ئەوكات دەزانن كە ئاگادار كەرەوەى خودا چۆنە كەپێشتر ئاگادارى ئێوەى دەكردەوەو دەیفەرموو﴿وَيُحَذِّرُكُمُ اللّهُ نَفْسَهُ﴾ ال عمران:٣٠ واتە خوداى گەورە ئێوە ئاگادار دەكاتەوە لە خۆى كە وریا بن توشى نەفرەتى خودا نەبن جا ئازیزانم بۆیە پێش ئەوەش مەنزیلەى تەوبەیە ئێمە زۆر بە سادەو ساكارى لە تەوبە گەیشتووین ئەویش ئەوەیە برۆ هەندێك لە خودا بپارێوە هەندێك دەست بڵند كەو بڵێ خودایە تەوبە چیتر تاوان ناكەم نەخێر تەوبە زۆر زۆر گەورەترە لەوەى كە ئێمە تێگەیشتووین نەك ئەوە بەڵكو هەموو تەوبەكانمان تەوبەیەكى ترى دەوێ ئەو تەوبانەى ئێمە دەیكەین ئەویش تەوبەیەكى ترى دەوێ تا خوداى گەورە وەرى بگرێ لەبەر ئەوەى تەوبەكەشمان هەمووى پڕ لە ڕیایە و هەمووى پڕ لە ناتەواوى و هەمووى كەم و كوڕییە جا ئەو كەسەى كە دەیەوێ تەوبە بكا ئەو چەند ئایەتە باس لە تەوبە دەكات ئینجا چەند خاڵێك هەیە شى دەكەینەوە ئەم شتانە یارمەتیمان دەدا بۆ ئەوەى تەوبەكەمان دورست و ڕێك پێك بێ واباس دەكەین بە پشتیوانى خوداى بەخشەر و ڕەحیم.

یەکەم: خودای گەورەدەفەرمویٚ﴿وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ النور:٣١ تەماشا کەن خودای گەورە لەم ئایەتە ڕوو لە هاوەڵەکانە بە تایبەتی و بەگشتی موسڵمانەکانیش ئەو ئایەتە کاتێك هاتۆتە خوارەوە کە موسڵمانان هەمووی تەوبەکاربوینە کە هاوەڵەکانی لەوپەری ڕێك و پێکی و لەوپەڕی یەکسانی و تەقوای و ناسینی خودا بوینە وە لەوپەری خزمەت بوینە بۆ ئیسلام هەموو کاتێك خۆیان گیان فیدا کردوە بۆ خزمەت کردنی ئەم دینە پاکە ئینجا خودای گەورە فەرمانی پێکردینە و فەرموی﴿وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ النور:٣١ ئەوان لەسەر ئەو بارەی خۆیان کەتێدابینە وە هەوەها فەرموی تەوبە بکەن﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ واتە تکامان وایە بەو تەوبەیە ئێوە ڕزگارتان بیٚ دەی کەواتە هەرشتێك ببێتە مایەی ڕزگاری ئێمە ئێمە دەبیٚ بەدوایدا بکەوین یەك لەو شتانە کە مرۆڤ لە ڕۆژی دوایدا لە دۆزەخ ڕزگاری دەبیٚ لە ئەشکەنجە تەوبەی نەصوحە پاشان خودای گەورە دەفەرمویٚ﴿وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ الحجرات:١١

واتە ئەوانەی کە تەوبە ناکەن ئەوانە زۆردارن کەواتە خەڵك دوو بەشە یان زۆردارە یان تەوبەکارە لەو دووبەشە زیاتر کەسی تر نیە ئەوەی تەوبەکار بیٚ تەوبە بکا ئەوە خودای گەورە تەبەکەی قبول ئەکاو ڕزگاری ئەبیٚ لە ناخۆشیەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەی زۆرداریش بیٚ ئەوە بەرەو دۆزەخ دەچیٚ و باجەکەی لێوەردەگریەوە بۆیە خۆشەویستمان محمدالمصطفی(ﷺ) فەرمویەتی(ایها الناس توبوا الی الله انی لأتوب الی الله

فی یوم اکثر من سبعین مرة) له روایەتێکی تردا(انی لأتوب الی الله فی یوم مئة مرة) واتە خەڵکینە تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە لای خودا من هەموو رۆژێ زیاتر لەسەد جار تەوبە دەکەم.

ابوهریرە ئەی فەرموو والله لە یەك مجلسدا لەگەڵ پێغەمبەری خودا وەلەگەڵ صحابەکان سەد جاران ئەیان فەرموو(استغفر الله العظیم واتوب الیك) جا ئەگەر خۆشەویستان محمد المصطفی(ﷺ) رۆژی سەد جاران تەوبە بکا کە یەك کردەوەشی ڕیای تێدانەبووە یەك کردەوەی شەیتانی نەفرەتی نەی توانیە زەفەری پێببا ئەبێ ئێمە چەند پێویستی ئەو تەوبەیە بین ڕۆژی چەند جاران تەوبە بکەین بەس بۆ ئەوەی خودای گەورە تەوبەمان لێ وەربگرێ وە بزانین ئەو کەسەی کە توبە بکا دەبێت بە خۆشەویستی خودا چونکە خوای گەورە بۆ خۆی ئەفەرموێ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ﴾ البقرە:٢٢٢ واتە خودای گەورە ئەو بەندانەی خۆش ئەوێ کە تەوبە کارن وە هەروەها ئەو کەسانەشی خۆش ئەوێ کە خۆیان پاك دەکەنەوە فەرموودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) هەیە ئەفەرموێ(الطهور شطر الایمان) واتە پاکی نیوەی ئیمانە ئەو پاکیە مانای ڕوکارەکەی نیە ئەوەندەی مانای ناوەڕۆکەکەی هەیە یاخود ئەوەندی مانای چەوتی هەبێ ڕاستیەکەی نادا لەبەر ئەوەی زۆر کەس هەیە بەقەدەر یەك میسقالە زەرە تۆز لەسەر لاشەو شمەکی نیە بەلاَم فرِ ئیمانیشی نیە دەی کەواتە(طهور القلب من الرذائل والمعاص شطر الایمان) واتە هەر کەسێك خۆی ڕزگار کا لە تاوان وە لە بێ دینی خۆی ئازاد کردو ڕزگاری

بوو لە تاوانەکانی ئەوە نیوەی ئیمانی تەواو دەبێ چونکە بەو پاکیە مرۆڤ ئەتوانێ بە خزمەت خودا بگا بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێ﴿لَا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ﴾ الواقعه:٧٩

واتە قورئان نابێ تەنها مەگەر بەدەست نوێژ هەڵیگری ئەی ئەو کەسەی کە دەچیتە مزگەوت خودا نابێ بەپیسی بچیتە خزمەت خودا جا یەکەم مەرج ئەوەیە تۆ خۆت پاك بکەیەوە لە تاوان و وەتەوبەش باشترین ڕێچکەیە کە ئێمەی موسڵمان خۆمانی پێ پاك بکەینەوە خۆمان ڕزگار دەکەین لەداوی شەیتان و لەو هەموو خراپە کاریەی کە دڵی ئێمەی پڕکردوە وای لێ کردوە ئەو دڵانەمان ئەوتارێك ئەمردنێك ئەهەموو کارەساتێکی دونیا کارمان لێ نەکا والله پێم سەیرە کەسێك ئەمرێ ئەیبەنە سەر گۆر بە خۆی ڕانەوەستێ و فیتەی جگەرەیەتی و تەقەی سەری دێ پێم سەیرە هەواڵیم بۆ باس ئەکا واتە حیسابی خۆی ناکا ڕۆژێك دێ وەکو ئەو پیاوە دەمرێ یاخود ئەوەتا چەند ڕووداوێك دێتە پێشمان و ئەبیستین دەرس و عیبرەت وەرناگرین ڕۆژێك خودای گەورە ئاواش لە ئێمە بکا ئەوەش لەبەر چیە تاوان و شەهەوات و دەروونی پیسی خۆمان وا ئێمەیان ڕازی کردوە کە ئێمە بێ ئاگا بین و ئاگامان لە هیچ نەبێ جا بۆیە سەیرکەن خودای گەورە کاتێك باسی ئەو موسلمانانە دەکات خۆیان گیان فیدا دەکەن لە پێناو خودای گەورە دەرونی خۆیان دەفرۆشن بۆ خودا یەکەم سیفەتیان(التائبون) خودای گەورە دەفەرموێ﴿إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الجَنَّةَ﴾ التوبه:١١١ .

واتە خودای گەورە دەروون وماڵی لە ئیمانداران کڕیوە لەبەرامبەر چیان بداتێ ؟ بەهەشتیان بداتێ پاشان ئایەتەکە تەواو دەبێ باسی ئەو موسڵمانانە دەکا کە خۆیان دەفرۆشنە خوداو دەفەرموێ﴿التَّائِبُونَ الْعَابِدُونَ الْحَامِدُونَ السَّائِحُونَ﴾ التوبه:١١٢ یەکەم سیفەتی دەبێ تەبەکار بێ وە ئەو کەسەی تەوبە کار نەبێ بەخۆی نەفسی خۆی لەدەست شەیتانیەتی چۆن ئەتوانی خۆی ئازاد بکاو بیداتە خودا جارێ دەبێ خۆی لە شەیتان بکریتەوە خۆی نەجات بدا ئینجا نەفسەکەی خۆی بفرۆشێتە خودای خۆی پێشکەشی رب العالمین بکا ئازیزانم چەند شتێك هەیە دەبێ زۆر بەوەی کاتێك کە ئێمە دێین و ئەو مەقامە ئەبڕین و تەوبە دەکەین و تێبینی بکەین.

یەکەم: ئێمەی موسڵمانان کاتێك کە تاوانێك دەکەین زۆر کەیف خۆش دەبین ئەزانی کەیف خۆشیەکەمان لە تاوانەکە گەورەترە ئەزانی کەیف خۆشیت بەوەی کە تاوانەکەی دەکەی زۆر زۆر خودای گەورە توڕە ئەکا لەوەی کە تۆ تاوانەکە دەکەی کەواتە ئەوە زۆر هەڵەیە پێم سەیرە کاتێك کە تاوانێك ئەنجام نادەین غەمی بۆ دەخۆین غەم خواردنت لەبەر ئەوەی کە تاوانەکەت نەکردوە لە تاوانەکەت زۆر گەورەترە کاتێك کەوا کاریگەری و غەم دەخۆی پەژارەی کەتاوانێکت لە کیس چووە لای خەڵکی باس دەکەی ئەوە دەکەی دەڵێ ئاخ ئەم مامەلچەم لەدەست چوو کە ئەوەندە هەزارەم قازانج دەکرد کەچی بە حەڕامیت بوو ئەوە زۆر زۆر لە تاوانەکەت گەورەترە کە تاوانەکەت بکردایە جا ئازیزانم بە ڕاستی ئەو

کەسەی کەیفی دێ بە تاوان کردن دڵشاد ئەبێ لەو کاتەی کە توشی تاوان ئەبێ چەند خاڵێکی لەفکر کردوە یەکێك لەبیری کردوە کەوا لەکێ گیرابووە ئەگەر بزانی لە خودایەکی عەزیمی باڵادەستی کە خاوەنی ئەو کەون و کائیناتەبی گیرای بۆ هەرگیز ئاوا بەسوك و بەئاسانی تێناکەوی بە تاوان کردن وە بەتاوەنەکانی دڵشاد نابێ بەڵکو کاتێك کە تاوان دەکەی هەر پەشیمانی هەر پەشیمانیش ئەمینێتەوە هەر بە پەشیمانیش ئەپارێتەوە تاکو لەدونیا ئەچێتە دەرێ جا زۆر زۆر ترسناکە ئێمەی موسڵمانان کەیفمان بەتاوان بێ بەڵکو ئەوەی ئێمەی زەلیل کردوە لە ڕۆژی دوایی تاوانەکان چۆن ئەبێ پێبکەنی بەڵکو دەبێ دوژمن تاوانەکەی وەرقیشت لە تاوانەکانی ببێتەوە یەك لەم شتانە ئەوەیە ئەگەر بزانین ئەو خودایە گەورەیە و دورستکەرە کێیە و بیناسین هەرگیز ئاوا بە ئاسانی تاوان ناکەین کەیف خۆش نابین بە تاوانەکان کەواتە یەکەم شت ناسینی گەورەیی و هێزو دەسەڵاتی خوایە بۆ دوورکەوتنەوەمان کەتاوان و گوناه کردن.

دووەم: ئەو کەسەی کەیف خۆش ئەبێ بەتاوانەکانی کرداری خراپی خۆی لە یاد کردوە ئەگەر بێتو لەسەر ئەو تاوانەی ئاوا بمرێ و ئاوا بچێتە خزمەت خودا خودای گەورە چ ڕەفتارێکی بەتوندی چەند بە ئەزیەت و ئازارێك پێشوازی دەکا بەسە کە خودای گەورە تەماشای نەکا بەسە کە خودای گەورە پشت گوێی بخا بەسە کە خودای گەورە زنجیر بەندی بکا لە

ناو دۆزەخ بیسوتێنی و لەناو دۆزەخ بۆ خۆی بنالێنی و هاوار بكا جا خۆشەویستانم.

خالی سێیەم ئەو كەسەی كە تاوان ئەكا لە دوو جاردا ئەژی یان ئەوەتا دەبێ ئیمانی هەبێ خودا ئەبینێ یان ئەوەتا دەبێ ئیمانی نەبێ كە خودای گەورە ئەیبینێ لەو دووبارە ناچێتە دەرێ ئەگەر تۆ باوەرت هەیە كە خودا دەتبینێ چۆن ئەو تاوانە ئەنجام ئەدەی یان ئەوەتا تۆ زۆر بێشەرمی زۆر بێ حورمەتی بەرامبەر خودا بۆیە ئاوا تاوان ئەكەی یان ئەوتا دەبێ خودای گەورە نەتبینی مەعاذ الله هی یەكەمیان زۆر بێ ئەدەبیە هی دوومیان كوفرە جا بەڕاستی ئێمە لەو دوو بارەدا ئەژین ئەگەر ئێمە ئیمانمان هەیە كە خودای گەورە دەمان بینێ چۆن ئەتونین كەوا تاوانێك بكەین. دەگێڕنەوە جارێكیان یەك لە شێخەكان چەند موردیك و فەقێیەكی هەبوو یەكێ لە فەقێیەكانی زۆر ڕێزو حورمەتی دەگرت فەقێیەكانی تر پێیان ناخۆش بوو ئەیان ووت مامۆستا والله هیچ حەق نیە ئەو فەقێیە فەقیرەت خۆشتر دەوێ كە ئێمە زیرەك ترین جوانتر خزمەتت دەكەین ئەوت خۆشتر دەوێ و زیاتر گرنگی بە ئەو ئەو ئەدەی ووتی ئەوەی من لە ئەو دەبینم لە ئێوە نابینم ووتی باشە تاقیمان بكەوە مامۆستا ووتی باشە تاقیتان دەكەمەوە دەیسەلمێنم لە بەرچ ئەو كوڕەم خۆشتر ئەوێ و ڕێزی لێ ئەگرم ئەوە بوو ڕۆژێك ووتی هەر یەكە لە ئێوە ڕەشۆ لەیەك یان چۆ لە كەیەك بگرێ لە جێگایەك سەری ببڕی كەس نەیبینێ هەریەكە چوو ڕەشۆ لە یەكی هێنا ئەوەی لە پەنا دیوارێك و لە پشت مزگەوت و لە پیشت دەرگا

و هەریەکە لە لایەك سەری هەڵکێشا و سەری بڕی بەڵام ئەو کوڕەی کە شێخەکە خوشی دەویست و ڕێزی لێ ئەنا ئەو ڕەشۆ لەکەی لە دەست بوو سەرت هەموو ووتیان ئەوە چیە بۆ سەرت هەڵنەکێشاوە شوێنێك نەبوو کەوا مامۆستا نەتبینیّ ووتی بەڕێ وەالله جیّ زۆر بوو کەوا مامۆستا نەم بینیّ بەڵام بۆ هەر شوێنێك دەچووم خودام لێ دیار بوو خودای گەورە منی ئەبینی نەمتوانی هەڵکێشم تۆ بەئێمەت ووت لە جێگایەك سەری هەڵکێشن کە کەس نەتانبینیّ من بچمە کویّ کە خودا نەمبینیّ بۆیە نەمتوانی سەری ببڕم شێخەکە ووتی سەبرکەن ئەوەیە کە من گرنگی بەو کوڕە ئەدەم لەبەر ئەوەی بە بەردەوامی ئەو کوڕە ترسی خودای لە دڵە بۆیە سری سەقەتی ڕەحمەتی خودای لێبیّ ئەفەرمویّ خاڵم زۆر بە دین بوو کاتێك هەموو جار کە هەڵدەستام شەو ئەمبینی خاڵم شەو نوێژ ئەکا ووتی ئەچوومە ژێر پاڵتۆکەی ئاوا لەگەڵی ئەودا لەسەر کۆشی دائەنیشتم ئاوا ئەویش قورئانی ئەخوێند ڕۆڵە گیان شتێکت فێر ئەکەم تەمەنی حەوت ساڵ بوو کاتێك چوویتە سەرجێگا سیّ جا بڵێ (الله ناظري، الله سامعي، الله عليم بحالي) واتە خوا تەماشام ئەکا خوا گوێم لێیە خودا ئاگادارە بەحاڵم.ئەو پیاوە چاکە ئەڵێ هەتا گەورە بووم ئەو دوو سیّ ووشەیە منی پەروەردەکرد کە تاوان نەکەم هەر ئەو دوو سیّ وشەیە بوو منی پەروەردە کرد منی گەیاندە ئەو مونزیلەیەی کە لە خودای خۆم حاڵی ببم بۆ ئەوەی لە خودا نزیك ببمەوە جا بە ڕاستی ئەگەر مرۆڤ بزانیّ ئیمانی هەبیّ کە خودا تەماشای دەکا سوێند بەخوایە ناوێری یەك تاوان بکا ئەگەر تاوانیش بکا هەروەك

ووتمان یان ئەوەتا زۆر زۆر بێشەرمە بەرامبەر خودا یان ئەوەتا كافرە بڕوای نیە كە خودای گەورە ئەبینێ.

خاڵی چوارەم پێم خۆشە باسی بكەم ئەویش ئەوەیە سزای تاوان تاوانێكی ترە واتە تۆ هەر تاوانێك بكەی ئەو تاوانە سەر هەڵدەكێشێ بۆ تاوانێكی تر چونكە تاوانی دووەم سزای تاوانی یەكەمە هی سێ یەم سزای تاوانی دووەمە تاوات لێ دێ یەك ڕستە تاوان بكەی تاكو لە ناو ئەچی وای لێ دێت تەسلیمی بەردەستی تاوانەكان ئەبی ڕزگارت نابێ لەبەر چی؟ چونكە سزای هەر تاوانێك تاوانێكی كەیە جا ماڵ كاولێەكەی ئەلێرەیە واتە تۆ هەر تاوانێك بكەی سزای تاوانێكیكەبی ئەو پیاوە لە ناو دەچێ ئەگەر زووفكر لە حاڵی خۆی نەكاتەوە خۆی ڕزگار نەكا لە تاوانەكان ئەوە بەرەو هیلاكی ئەچێت. بۆیە خودای گەورە دەفەرموێ ﴿بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ المطففين:١٤ واتە وای لێهاتوە ئەوانە دڵیان ڕەش بووە ڕاهاتووە لەسەر تاوان ئەوەندەی سزای تاوان كرانە لەسەر تاوانی تر وایان لێ هاتووە ئەو شتە زۆر ئاساییە وە هەركاتێك مرۆڤ تاوانی لەلا سوك بوو نیشانەی هیلاك چوونیەتی هەر كاتیچك لادانی لەڕ یێ خودا لەلای ئاسان بوو نیشانەی ئەوەیە دڵت مردووە بڕۆ نوێژی مردووی لەسەر بكەوە كاتێك ئەگەر تاوانێك بكەی وە زۆر پەشیمان ببیەوە دڵت لەرزی زانیت ئەوە پێچەوانەی خودات كردوە بزانە دڵت نوری ئیمانی تیاماوە ئەما ئەگەر شتێكی ئاسایی بوو ڕۆژی سەد نەزەر سەد درۆی دەكرد كاریشی

لێنەدەکرد واللە دڵت مردووە برام بۆ خۆت برۆ دلێکی تر بکڕەو ئەو دڵەی تۆ هیچ سوودی نەماوە جا ئازیزانم.

پێنجەم: خاڵێکی تر کە باسی بکەین ئەویش ئەوەیە بزانین ئەو تاوانەی ئەیکەی زۆر گەورەیە واتە مرۆڤی ئیهانەیە تاوان نەکەی هەر چەندە تاوان لای تۆ گەورە بێ لای خودا بچووکە هەرچەندە لەلای تۆ بچووك بێ لەلای خودا گەورەیە بۆیە ئەبو هریرە ئەی فەرموو کەسانی سەردەمی خۆی پێم سەیرە ئێوە تاوانی وا ئەکەن لە زەمانی پێغەمبەر(ﷺ) بە تاوانە گەورەکان دەژمێردرێ بۆ لەبەر ئەوەی زەمانی هاوەڵان لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) بچووك گەورە بوو لەبۆ ئەوان هیچ تاوانێکیان بە چاوێکی بچووك تەماشا نەدەکرد بۆیە خودای گەورە زۆر بە ئاسانی ئەوانی دەبەخشی هەر مرۆڤێك ئەگەر بزانێ تاوانەکەی زۆر گورەیە ئەگەر تاوانەکەی بچووکیش بێ ئەوە خودای گەورە بچووکتری ئەکاتەوە لێی خۆش ئەبێ.

شەسەم: خاڵێکی تر ئەوەیە ئەو شتەی کە تاوانی پێ دەکا و تاوانی پێ دەکەی دەرونی خۆتە دەبێ ئەو دەرونەی وای لێ بکەی ڕابهێنی لەسەر خودا پەرستی و تاعەت چۆن ڕاهاتووی لەسەر ئەوەی کە تاوانت پێ دەکاو بۆتە شتێکی ئاسایی کە تاوانت پێ دەکا دەبێ بەو شێوەیە سزای دای بدەی وا ڕای بهێنیت کەواز لە تاوان بێنێ.

حەوتەم: خاڵێکی تر ئەوەیە کە شەیتان دوژمنی ڕاستەقینەی تۆیە ئەمە خالی سەرەکیە چونکە خودای گەورە بە ئێمەی فەرمووە دەبێ دوژمنکاری

لەگەڵ بکەین ئەو شەیتانە دەبێ زەفەری پێ ببەی چونکە شەیتان مرۆڤی بەحەوت قۆناغدا دەبا ئەگەر خۆی لەو حەوت قۆناغەکە پاراست ئینجا تۆ ئازاد ئەبی کەفێل و حیلەی شەیتانی:

یەکەم: کوفرە چونکە شەیتان هەتا پێی بکرێ کوفرت پێ ئەکا ئەگەر نەیتوانی ئەوا ئەچێتە خاڵی دووەم.

دووەم: بیدعە.

سێیەم: تاوانی گەورە.

چوارەم: تاوانی بچووک.

پێنجەم: موباحات یەعنی ئەگەر هیچ بەتو نەوێرا لە گوناح کردن بە تاوانی بچووکیش دەرەقەتت نەهات ئەوەندە زۆر بنوو زۆر بڵێ زۆر بخۆ ئەوانەش زۆر موباحات وای لێ دێ توشتی تاوانت دەکا ئەگەر هیچ ئەوەشت پێ نەکرا لەگەڵی تۆ چیت لێدەکا.

شەشەم: ئەو شتەی کە خێری زۆر زۆرە وات لێدەکا ئەوە نەکەی شتێکی تر بکەی کە خێری کەمتر بێ ئەگەر هەر ئەوش نەبوو. حەوتەم: ئەوە بە ئەعوانی خۆی و سەربازی خۆی وات لێدەکا کە ئازارت بدا هەتا ئەوەیان پێغەمبەرانیش لێی بێ بەش نەبوینە خاڵی کۆتایی پێغەمبەرانیش لەو شەیتانەی ئەزیەتیان خواردوە پێغەمبەرمان بۆ خۆی ئەمەی ئەفەرموێ(ﷺ) من نوێژم ئەکرد شەیتان هات ئاگرێکی هێنا کە بە چاوم دادا بەلام گرتم گورگم گرت ویستم لە دینگەیەکی مزگەوت ببەستمەوە

هەموو منداڵەکانی شاری مەدینە تەماشای بکەن هەتا دەفەرمویٚ لیکاوی گەرمی دەمی شەیتان بەسەر دەستم هاتە خواریٚ جا خۆشەویستان ئەوە چەند خاڵێك بوو لەمەر تەوبە کردن ئێستا من بە کورتی مەرجەکانی باس ئەکەم:

یەکەم: ئەو کەسەی بێتەوە مەرجی سەرەکی قەبول بوونی تەوبە پەشیمانی بەندەیە لەو تاوانانەی کە کردویەتی.

دووەم: دەبیٚ واز لە تاوان بێنیٚ.

سێیەم: زۆر بپارێتەوە لە خودای گەورە کە لە گوناهی خۆش بێت و پەیمان بدات بە خودا کە جارێکی تر نەگەرێتەوە سەر تاوانەکان.

چوارەم: نەگەرێتەوە سەر گوناه.

پێنجەم: دڵت زۆر زۆر بشکیٚ بەرامبەر خودای گەورە(انکسار القلب) ئەوە زۆر گرنگە ئەو کەسە خۆی نەشکێنی بەرامبەر خودای دڵی خۆی نەشکێنی ئەوە ئەو مەغفرەت و لیٚ خۆش بوونی خودای بەرناکەویٚ جا انشاالله لە خودای گەورە داواکارم کەوا سوودمان لیٚ وەرگرتبیٚ تاوەکو وانەیەکی تر بە خواتان ئەسپێرم وە خودا تەوبەری هەموو لایەك قبول بکات والسلام علیکم ورحمە الله وبرکاتە.

# ٥- با پەند وەرگرین لەم بەسەر هاتە

بسم الله الرحمن الرحيم

وصلى الله وسلم وبارك على سيدنا وحبيبنا محمد وعلى اله وصحبه اجمعين .السلام عليكم ورحمه الله وبركاته.

بابەیەکەوە پەند وەرگرین لەم بەسەر هاتە:

کوڕە گەنجێك دەبێ لە خێزانێك ئەم کوڕە گەنجە دایك و باوکی لێی ناپیچنەوە ئەم کوڕە چ دەکا لە دەرەوە ئیشی چیە و لەگەڵ کێ دەگەڕێ دەوڵەمەند لە خۆبایی هەبوون ڕۆژ پاش دەوامە فاشیلەکەی لە کۆلێژ دێتەوە سواری ئۆتۆمبیل دەبێ لەگەڵ چوار پێنج برادەری نارێکی وەکو خۆی ئەگەڕێن بە دوای کچ و ئابروی خەڵکی قسە لەگەڵ ئەم و ئەو دەکەن و گاڵتەیان پێدەکەن و سواری ئۆتۆمبیلیان دەکەن و ئەزیەتیان دەدەن ئافرەتیش هەنە ئەوەندە فەقیرو ساویلکەنە غەریبن ئەوەندە دڵ ساف و سادەن بە قسەی شیلاەی شیرینی وەکو هەنگوینی ئەم کوڕە گەنجانە هەڵدەخەڵەتێنن زۆر ئافرەت هەن بە مۆبایل هەڵخەڵەتاینەو بەسەهویان بردوون وریا بن خوشکانی من دایکانی من وریا بن شەرەف و ناموسی خۆتان مەدەنە مرۆڤێکی گورگ کە پیستەکەی ئیوەی دەوێ و

ئێسکەکەتان فڕێ ئەدا تەنها لاشەی ئێوەی دەوێ و ناموسەکەشتان فڕێ ئەدا.

کەرامەتیشتان فڕێ ئەدا وریابن کەسێك کە تەماشای کردی تەماشای مەکە کەسێك کە قسەیەکی پێ ووتی ئاوڕی لێمەدەوە خۆشەویستانم ئەم کوڕە گەنجە زۆر لەخۆبایی بوو زۆر لە کچانی فەقیرو سادە ببوە قوربانی ئەمەوە هەڵی خەڵەتاندبوون ڕۆژێکیان خۆی بە ئافرەتێ:ی ساوێلکە و غەریب دەناسێنێ پاش ئەوەی بە مۆبایل زۆر قسەی لەگەڵ دەکا کە یەکتری ببینن پاشان یەکتری دەبینن یەکتریان خۆشدەوێ پێکەوە پیاسە دەکەن پاشان ئەو نامەردە داوا لە ئافرەتەکە دەکا دەڵێ سەرجێیم لەگەڵ بکەی ئەویش ووتی هەرگیز ئەوە نابێ وەرە خوازبێنیم وەکو مەردان لای باوکم داوام بکە ئینجا بە چاوان ئەویش ئەڵێ نا هەر دەتهێنم جارێ با هەندێك ڕابوێرین کە ئافرەتەکە ڕازی نابێ ئەویش هەرەشەی لێ دەکا بەوەی کە دەنگی لە مۆبایل خەزن کردوە ئەگەر بە قسەم نەکەی بۆ باوك و برات دەنێرم و فەزعت دەکەم و ناموست دەبەم ئافرەتەکەش زۆر غەریب بوو ئەڵێ بەقوربانت ئەبم بەس مەیاندێ چیت دەوێ من حازرم سەیرکەن خوشکانم ئەگەر ئێوە قسە لەگەڵ هیچ و پوچێکی ئاوا نەکەی ئەوا ناتوانی هیچتان بەرامبەر بکا بۆ خۆتان جلەوتان دایە دەستیان بە قسەی شیرین ئەوانە هەڵخەڵەتان بە خۆتان ڕێگاتاندا بەو کوڕانە قسەتان لەگەڵ بکەن ئەگەر ژمارەکەت نەناسی هەڵی مەگرەو وەڵامی مەدەوە لەگەڵی پێدامەرۆ شەیتان هەڵتدەخەڵەتێنی پێی گوت

ئەگەر بێتو نەیەتە مەوعید ئەتسوتیچنم واللە لەناو خەڵکی حەیاو شەرەفت ئەبەم ئافرەتی قوربەسەریش موعیدی دایە لە فلان شوێن کەوا ئەو ئیشە دەکەین بەڵام دوایی نەچوو ترسا بچێ ماوەیەکی پێچوو دیسان کوڕەکە هەوڵی لەگەڵدا چونکە ببوە عوقدە لە دڵی کە چۆن ئەو جارە نەهات و قسەی شکاندم دەزانم چیت لێدەکەم زۆری دەترساند ئەو ئافرەتەشقەدەری خودای گەورە نەچوو بە کوڕەکەشی ووتبوو دێم لە ترسان مەوعیدێکی دانا لە فلان شوێن ئەم کوڕە نارەسەنە بۆ ئەوەی رق و کینەی خۆی بەرامبەر ئەو کچە هەڵبرێژێ چوار پێنج برادەری هەبوو ووتی ئێستا سەعات چواری ئێوارە کچێك دی بەس بتان بینم بەهەر چوارتان وەهای لێبکەن ناموس وکەرامەتی ببەن چوار کەسی وەکو خۆی نارێك چوار گورگ خۆیان حازر کرد کوڕەکەش لە جێگایەك پاڵی داوە ووتی کاتێ: کە ئیشەکەتان تەواو کرد هەر چوارتان لەخۆبونەوە ئینجا بانگی من بکەن لەو کات ئافرەتێکی جوانی رێك و پێك هات ووتی فلان کەس لێرەیە ووتیان کارت پێیە ووتی بەڵێ کارم پێ هەیە.

یەکسەر گرتیان بەبێ ئەوەی پێی بڵێن تۆ کێی بردیانە ژوورێ زۆر زۆر وەزعیان تێکدا زۆر وەزعی تێکچوو ئینجا بانگی ئەو موجریمەیان کرد ووتیان وەرە چیت ووت حازرە جێ بە جێ مان کرد زۆری کەیف هات ووتی دەستیان خۆش بێ زۆر مەمنونم ئاوای لێدەکەم چۆن قسەی من دەشکێنێ بەڵام کە دیستی ڕاست لە هۆش خۆی چوو ئاویان بەسەردا کرد ئەوە چ بوو ووتی کوڕە خوا بتان گرێ ئەوە خوشکمە کێ ووتی ئاوی لێبکەن

ووتیان ئەی خۆت بە ئێمەت نەووت ناوی چیە ووتت ئافرەتەکە هات لە منی پرسی وای لێبکەن ئەمەش وامان لێکرد تازە ملت بشکێ خوشکتە خوشکت نیە شەرەف و ناموسی خۆت رۆیی ئینجا کوڕەکە لەسری خۆیدا ئافرەتی قوربەسەریش لەهۆش خۆی چووبوو بەپەلە بردیانە نەخۆشخانە کوڕەش لە هۆش خۆچووە بزانن چۆن ئەمە روویدا تەقدیری خودا ئەو ئافرەتەی کە دۆستی بوو نەوێرا بچێ جاری دووەمیش ترسا ئەیزانی ئەو گورگە پێویێ:ی هیچ و پووچە زۆر ترسا نەوێرا بچێ خوشکی کوڕەکە سبحان الله لەماڵی ووتیان برۆ برات بانگکە باوکت کاری پێیە والله نازانم لە کوێیە باوکی ووتی ئەو خوێریە لە فلان شوێنە لەگەڵ برادەرانی لەوێ کۆدەبنەوە برۆ لەوێیە بانگی بکە خوشك نازانێ چ مەسەلەو بانگو خواسە یەکسەر هات توشی ئەم گورگانە بوو تاکو حاڵی بەو حالە گەیشت خۆشەویستانم وریابن گەمە بە ناموسی خەڵك مەکەن(من دَقَّ دُقَّ) ئەوەی لە دەرگای خەڵك بدا خەڵکیش لە دەرگای ئەدەن ئەوەی دەرگای خەڵکی بەهەژێنی خەڵکیش دەرگای دەهەژێنن وریابن خودای مونتەقیم لە ئاسمانەو چاوی لە هەموو شتێکە براکانم شەرەف و ناموس و کەرامەت زۆر گەوریە بیپارێزن بە پاراستنی چاوو دڵ و داوێننتان. هیچ و پوچی ئەم کوڕە بوە هۆی ئەم وەزعە چونکە ئەم باوکە رۆژێك نەبوو لە کوڕەکەی بپێچێتەوە و بزانێ لە کوێیە دەستی کوڕەکەی بگرێ بەنەرم و لەسەرخۆی لەناو ئەو گورگانە دەری بێنێ جا ئازیزانم بە ڕاستی ئەمە دەرس و پەندی زۆری تێدایە بۆ ئەوەی بە ئاگابین تاکو کچ و کورەکانمان جوان پەروەردە بکەین

و یارمەتیان بدەین لەسەر کاری چاك و خێر پشتیان بگرین تاکو پارێزراوبن لە هەموو کارێکی ژیانیان هیوادارم ئەم بەسەر هاتە سوودی هەبێ بۆ گشت لایەکمان ببێتە پەندو ئامۆژگاری یارەبی خودایە هەموولایەکمان بپارێزی لە هەموو تاوان و کردەوەیەك کە ببێتە مایەی ئەوەی تێدا شەرمەزاری دونیا و دوا رۆژمان بکەی یارەبی خودایە هەموو ژیانمان بۆ کاری خێرو چاکە تەرخانکەی یارەبی خودایە دین و ئیمان و باوەرمان قایم و پتەو بکەی امین امین والحمدالله رب العالمین والسلام علیکم ورحمه الله وبرکاته

# ناوەرۆك